# کۆمەڵگای مەدەنی و خەباتی مەدەنی

جین شارپ و رابێرت هێلوی





وەرگێڕانی
تالب قەیسەری

# کۆمەڵگای مەدەنی
# و
# خەباتی مەدەنی

**جین شارپ و رۆبەرت هێلوی**

**وەرگێڕان**

**تالب قەیسەری**

**پێداچوونەوەی**

**هاوار هەڵەبجەیی**




**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

● **کۆمەڵگای مەدەنی خەباتی مەدەنی**

● **نووسینی:** جین شارپ و رۆبەرت هێلوی

● **وەرگێڕانی بۆ فارسی :** مێهدی کەلانتەرزادە

● **وەرگێڕانی بۆ کوردی :** تالب قەیسەری

● **پێداچوونەوەی:** هاوار هەڵەبجەیی

● **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی

● **بەرگ:** رێمان هەولێری

● **نرخ:** ٢٠٠٠ دینار

● **چاپی یەکەم ٢٠١٣**

● **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە

● **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)

● **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٢٤٥)ی ساڵی (٢٠١٣) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٢٧)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێڕست

## پێشەکی:

هەوڵدان بۆدەوڵەمەندکردنی نووسین و وەرگێڕان بە زمـانی کـوردی هـەنگاوێکی گرینگـە بۆدەوڵەمەندکردنی وێژەو زانستو فەرهەنگو کلتووری گەلی کورد.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو راسـتییە کـە دەوڵـەتی سـەربەخۆ هانـدەرو فاکتـەرێکی گرینگـە لەپاڵپشتی کردنو فەرمی بوونی زماندا، لەهەر وڵاتێکیش زمان رەسمی بێ ئەو وڵاتـە بـەهۆی زەرووڕەتـی مـەکاتباتی ئیـداریو خوێنـدنو نووسـین دەتـوانێ لەراسـتای گەشـەکردنیدا شوێنەوارێکی پۆزەتیڤی هەبێ، بەدرێژایی مێژوو گەلی کورد لەهەر چوارپارچەکەی کوردستاندا لەرووی چاندو کلتووری خۆیەوە ئاسمیلە کراوەو تا ئەم چەندساڵەی دوایی رێگای پێنەدراوە بـە شێوەیەکی فەرمی و نافەرمی زمانی خۆی بۆ نووسین بەکار بێنێ.

بەهۆی ئەو دەرفەتەی کە لەم ماوەیـەدا لـە حکوومـەتی هـەرێمی کورسـتاندا بـۆ کـورد رەخساوە، نووسین و وەرگێڕان بە زمانی کوردی گەشـەکردنێکی زۆرباشـی بەخۆیـەوە بینیـوە، بەتایبەت لەزانکۆکاندا زمانی کوردی بۆتە زمانی خوێندن و نووسین و هـەروەها بـەڕێوەبردنی دەیان فستیڤاڵی ئەدەبی و هونەری و دامەزراندنی دەیان ناوەندی چـاند و وێـژەی کـوردی کـە بۆتە ناوەندێك بۆ گەشەپێدان و بەرەوپێش بردنی ئەدەبیاتی کوردی، کاریگەری لـە بـەرەوپێش چوونیدا بە خۆیەوە بینیوە.

کتێبی خەباتی مەدەنی و کۆمەڵگای مەدەنی یەکێك لەو بابەتە گرینگانەیە کە لەراستای گەشانەوەی کۆمەڵگا و گەیاندنی زانیاریی سەردەم بۆ چین و توێژەکانی کۆمەڵگای کوردەواری، دەتوانێ ئەزموونێکی سەرکەوتوو بێت، لەم سەردەمەدا بەرەوپێش چوونی دیموکراسی دەورێکی کاریگەری لەراستای وشیاری و گەشەکردنی کۆمەڵگای جیهانی هەیە، بەتایبەت کە هەنووکە لەرۆژهەڵاتی ناوەراست گۆڕانکاری لەئارادایە.

لەسیستمێکی دیموکراتیکدا، کۆمەڵگای مەدەنی گەشەکردن بەخۆیەوە دەبـینێ، وەرگێڕانـی ئەم کتێبە لەلایەن برای بەڕێز کاك تالب قەیسەری کارێکی زۆرگرنگو بەنرخە، زەحمەتی زۆری پێوەکێشاوە و دیقەت و ماندووبوونی پێوە دیـارە کـە لـەبواری وەرگێڕانـەوە جێگـای دەسـت

خۆشییه و هەم لەروانگەی منیشەوە هەڵبژاردنی ئەم کتێبە وەك سەرچاوەیەکی باش دەتوانێ لەئاستی خزمەتکردن بە گەشەکردنی دیموکراسیو کۆمەڵگای مەدەنی جێگای سەرنج بێت، بەو هۆیەوە کە ئێمە لەهەنگاوەکانی سەرەتایی ئەم قۆناغەداین پێویستمان بە وشیاری و زانیاری لەبواری زانستی و ئاکادمی هەیە، کتێبە بەکەڵکەکانی پێوەندیدار بەدیموکراسی و کۆمەڵگای مەدەنی کاریگەری خۆی لەسەر بەرەوپێش چوونی ئەم رەوتە هەیە.

هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازم و دەستخۆشی لێدەکەم، هیوادارم کەسانی دیکەش هەر وەك تا ئێستا بەرچاو دەکەوێ لەدەوڵەمەندکردنی سەرچاوە کوردییەکان چ وەك نووسین یان لێکۆڵینەوە و وەرگێڕان بە پێی توانای خۆیان هەنگاو هەڵگرن.

کاوە بەهرامی

# پێشەکی وەرگێڕ

جیاوازیی بیروڕا و دژایەتی نێوان خەڵك و دامەزراوە مەدەنییەکان لەگـەڵ حکومەتـدا، ئەمڕۆکـە لەزۆربەی وڵاتان و تەنانەت وڵاتە گەشە سەندووەکانیشدا هەیە.

خەڵك بۆ دەست گەیشتن بە مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤایەتی، وەك دامەزراندنی حکومەتی قـانون، بەرانبەریی سیاسی، ئازادیی رادەربڕین، پەرەپێدان بە رێکخراوە مەدەنییەکان، دەرفەتی کار و ئـابووری یەکسان، بنبڕکردنی دیاردەی جیاکردنەوەی رەگەزی، ئایینی و نەتەوایەتی و خۆش بژێوی کـە هـەرکام لەمانە، داخوازی سەرەکی و بنەڕەتی هـەرمرۆڤێکن. بێگومـان ئـەم داخوازییانـە لەگـەڵ دەسـەڵاتی حکومەتە پاوانخواز و سەرەڕۆکاندا لە دژایەتی دایە، هەر بۆیە دژایەتی و جیـاوازیی لـەنێوان خـەڵك و دەسەڵاتدا شتێکی حاشاهەڵنەگرە.

ئەمڕۆ لەوڵاتە دیموکراتیك و مەدەنییەکاندا، هاوئاهـەنگ و لەگـەڵ گەشـەی سیاسـی و ئازادییـە مەدەنییەکان، شێوەی ناڕەزایەتی دەربـڕینیش گـۆڕانی بەسـەردا هـاتووە، لـەم وڵاتانـەدا نافـەرمانی مەدەنی و خەباتی جەماوەری بەشـێوەیەکی رێکوپیـك٠ و رێکخراوەیـی بـەرێوە دەچـێ، لەحاڵێکـدا لەوڵاتە گەشەنەکردوو(جیهان سێهەم)و دواکەوتووەکاندا، کە سیستەمێکی سەرەڕۆ و دیکتـاتۆر حـوکم بەسەر خەڵکی ئەو وڵاتانەدا دەکات، خەڵك بـە ناچـار بـە شـێوەی رادیکـاڵ بـەرەنگاری حکومـەت دەبنەوە، کە رەنگە لەئاکامدا شەڕ و پێکدادانی لێ بکەوێتەوە.

هەروەك دەزانـین خـەبات هـاورێ و هاوتەمـەنی ژیـانی مرۆڤایەتییـە" خـەبات و تێکۆشـان بـۆ بەدەستهێنانی ژیانێکی شیاو و باشتر، بە درێژایی مێژوو وەك ئامانجی سـەرەکی زۆربـەی کۆمـەڵگای مرۆڤایەتی هەوڵی بۆدراوە ، بەڵام شێوازی ئەم خەباتگەلە جیاواز بوونە.

مێژوو نیشانی داوە کە باشترین مێتۆد بۆ بەرێوەبەریی وڵات دیموکراسییە، هەربۆیە بۆ رزگار بـوون لە چنگ سەرەڕۆیی و پاوانخوازی و گەیشتن بـە دیموکراسـی و کۆمەڵگایـەکی دادپـەروەر، رێگایـەکی دژوارمان لەپێشە. بێگومان بۆ درێژەدان بە خەبات لەم پێناوەدا جـەماوەر و کۆمــەڵگا پێویسـتی بـە رێبەر و رێنیشاندەرێکی لێهاتوو هەیە، کە لەهەڵەکانی دوژمن، بە قازانجی خەبات کـەڵك وەرگرێـت و شارەزای هەموو شێوازەکانی خەبات بەتایبەت خەباتی ناتوندوتیژی بێت.

خەبات بۆ ئازادی رەنگە تێچووی زۆری هەبێ، ئەویش ماڵوێرانی، برسێتی، ئـاوارەیی، پشـێوی و هتد...، بەڵام ئاکامی ئەرێنیش بە دوای خۆیدا دێنێ، کە نوێگەری، چالاك بوون، دیموکراسی، ئـازادی و بە گشتی گۆڕانی کۆمەڵایەتییە.

ئێمەی کوردیش بە درێژایی مێژوو لەلایەن داگیرکەرانـەوە هـەردەم چەوسـاوینەتەوە و مـاڵ و حـاڵ و ئاسایش و نیشتمانمان داگیرکراوە و بێپسانەوە بۆ بەدەستهێنانی ماف، ئازادی، کەرامەتی مرۆیی و مـافی چارەی خۆنووسین، هەوڵمان داوە و لەم ڕێگایەشدا لە هەموو شێوازەکانی خەباتیش کەڵکمان وەرگرتووە.

بەسەرنجدانی مێژوو، بۆمان دەردەکەوێ کە شۆڕشی کورد بۆ ئازادی و گەیشتن بە ژیانێکی باشـتر، بەردەوام لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە بەتوندی کەوتۆتە بەر دڕندانـەترین شـێوە و بـێبەزەییانـە سـەرکوت کراوە و هەرجارەش دەستی ئاشتی و نیازپاکی ڕێبەرانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کـورد، بـەپیلانێکی دەسەڵاتدارانی دڵ ڕەش و قین لە دڵی کورد، بە کوشتن وتیرۆرکردن وەڵام دراوەتەوە، بۆیە ناچـار بووینـە بۆ بەرگری لە خۆمان، ڕێگای خەباتی چەکداری هەڵبژێرین. سەرەڕای ئەمانەش، کورد هەر ئاشتیخواز بووە و هەر باوەڕمان بەخەباتی مەدەنی و ئاشتیخوازەنەیە.

بە تێڕوانین لەوەی کە هەنووکەش گەلی کورد لەحاڵی خەباتێکی ڕزگاریخوازانـەی نەتەوایەتیدایـە، پێویستە تێڕوانین وخوێندنەوەیەکی نوێ و سەردەمیانەمان لە خەبات هەبێ، هەربۆیە بە پێویستم زانـی کتێبی کۆمەڵگای مەدەنی و خـەباتی مـەدەنی، بـەرێزان جـین شـارپ و رابێـرت هێلـوی، لـەزمانی فارسییەوە وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی. بەو هیوایەی ئەم کتێبە بتوانێ لە بەرەو پێشـبردنی خـەباتی مەدەنی و شارستانیی نەتەوەکەماندا کاریگەریی هەبێ.

هیوادارم هاوڕێیانی خوێنەریش لە ڕەخنە و پێشـنیارەکانیان لەسـەر وەرگێڕانـی ئـەم کتێبـە بـێ بەشمان نەکەن، چونکە بێگومان یارمەتیدەرمان دەبێت بۆ بەرهەمەکانی داهاتوومان.

لەکۆتاییدا ئەم وەرگێڕانە پێشکەش دەکەم بەگیانی پاك و هەرگیز نـەمری شـەهیدان مامۆسـتای دیموکراسی و پێغەمبەری ئاشتی، دوکتۆر قاسملووی هەردەم لەیاد و دوکتۆر سادق شـەرەفکەندی، کـە ئەویش بەحەق وەك مامۆستاکەی دیمـوکرات و ئاشـتیخواز بـوو و سـەرەنجامیش، لـەپێناو ئاشـتی و ئازادی و دیموکراسیدا و لەسەر مێزی وتووێژ بۆ ئاشـتی، بـوون بـە قوربـانیی پیلانـی کاربەدەسـتانی پەروەردەکراوی مەکتەبی ئیمام زەمان وقوتابیانی ڕێبازی ویلایەتی فەقیە و شەهید کران.

وەرگێر: تالب قەیسەری

١٣٨٩/١٢/١٨

٢٠١١/٠٣/٠٩

## دیموکراسی چییه؟

حکومەتی خەڵك سالار یان حکومەتی دیموکراتیك، بەحکومـەتێك دەوتـرێ کـە هـەموو هاووڵاتیان، راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە رێگای نوێنەرە هەڵبژێردراوەکانیانەوە، لە دەسـەڵاتدا بەشدارن و چاودێری هەنگاوەکانی حکومەت دەکەن و لە راستیدا ئەوە خەڵکە کە دەسـەڵاتیان هەیە بەسەر یاسادارێژ و حکومەتدا. خەڵك سالاری یـان دیموکراسـی، کۆمـەڵێك لـە رێسـا و میتۆدەکانە کە پشتیوانی لە ئازادی و سەربەستیی مرۆڤ دەکا، دیموکراسی یان خەڵك سالاری، جێگیر بوونی ئازادییە، کە لەسەر بناغەی حکومەتی زۆرینە و پارێزگاری لە مافی تاکـەکان و کەمینەکان دامەزراوە  و وێڕای رێزلێنان بۆ خواستی زۆرینە، داکۆکیکاری سەرسەختی مافـە سەرەکییەکانی تاکەکان و هەروەها گرووپ و کەمینەکانە.

لەناو حکومەتی خەڵك سالاردا، خەڵك دەزانـن کـە یـەکێك لـە کـارە سـەرەکییەکانیان، داکۆکیکردنــە لەمافــە ســەرەتاییەکانی وەك، ئــازادی رادەربــڕین، ئــازادی ئــایین، مــافی سوودمەندبوونی یەکسان لەپشتیوانی قانون و دەرفەتی رێکخستن و بەشـداریکردنی تـەواو لـە پرسە سیاسی،  ئابووری و فەرهەنگییەکانی کۆمەڵگادا.

حکومەتـە خـەڵك سـالارەکان بەشـێوەی رێکوپێـك، هەڵبـژاردنی ئـازاد و دادپەروەرانـە بەرێوەدەبەن، کە هەموو هاووڵاتییان مافی بەشداری کردنیـان تێیـدا هەیـە. خـەڵك سـالاری، حکومەتەکان یاسامەند دەکا و ئەمە هەڵگری ئەوەیە کە هەموو هاووڵاتییان لـە پشـتیوانیی بەرانبەریی قانون سوودمەند بن و سیستمێکی قانونی داکـۆکی لـە مافـەکانیان بکـات. لـە سیستمێکی خەڵك سالاردا،  هاووڵاتیان لە  بەرانبەر ئەو مافانەی کە هەیانە، دەبێ هەست بە بەرپرسیارێتیش بکەن، کە یەکێك لە گرنگترین بەرپرسیارێتییەکان، بەشداریکردن لەسیسـتمی سیاسی کۆمەڵگادایە بۆ ئەوەی بەرگری بکەن لەماف و ئازادییەکانیان.

## حکومەتی دیموکراتیك(دیموکراسی) لە چ هەلومەرجێکدا پێك دێت؟

دیموکراسی بەر لەوەی شێوازێك  بێت لە حکومەت، شێوازێکە لە ژیان. بـەم واتایـەی کـە دیموکراسی رەگ و ریشەی لە بیروباوەڕی تاکەکانی کۆمەڵگادایە و لەکۆمەڵگایەکدا پێك دێـت کە خەڵك، لە گۆشەنیگای کۆمەڵایەتییەوە خاوەنی کولتوری"تێگەیشتن لە هەبوونی ئەوی‌دی" و لە گۆشەنیگای سیاسییەوە، ئامادەی قبوولکردنی را و بیروباوەڕی فرەچەشنن.

پێكهاتەی ئەخلاقی ئـەم كۆمـەڵگایــە، لەســەر بنــەمای دەســتەبەركردنی ئازادییــە تاكــە كەسییەكان و بەرتەسككردنەوەیان لەسنووری دەست تێوەردان لەگەڵ ئازادیی كەسـانی دیكـە دایە. تاكەكانی ئەم چەشنە كۆمەڵگایانـە، بەختـەوەری و پێشـڤە چـوونی خۆیـان لـەگرەوی پێشكەوتن وباشتركردنی دۆخی كۆمەڵگادا دەزانن. تێپـەڕبوون لـە حكومـەتی سـەرەرۆ یـان نیوەسەرەڕۆ و پێكهێنانی حكومەتێكی جەماوەری لە رێگای ئامانجخوازیی گرووپێكەوە پێـك دێت و رێبەرانی خەبات، تەنیا لە یەكانگیری و شكڵ پێدانی رەوتی خەباتدا رۆڵ دەگێڕن. ئەم شـــێوازە لـــەو كۆمەڵگایانـــەدا كـــە ســـەرەرۆیی دزەی كردۆتـــە نـــاو هـــەموو دامـــەزراوە كۆمەلآیەتییەكان، بەشێوەیەكی دیكەیە. لە وەهـا كۆمـەڵگایەكـدا، دامـەزراوە فەرهـەنگی و كۆمەلآیەتییــەكان، لەگــەڵ دیموكراســیدا ســازگاری و تــەباییان نییــە، چـوونكە ئـەم جـۆرە كۆمەڵگایانە لەسەر بناغــەی قــازانجی تاكەكەســی بنیــاد نــراون و ئەگــەر لــە بارودۆخێكـدا پێكهاتەی كۆمەڵی بەخۆوە بگرێ، ئەو پێكهاتە شتێك نییە زیاتر لە هاودەنگیی خزمایەتی و خێلآیەتی، كە بێگومان ناتوانێ قازانجی یەك بەیەكی تاكەكانی ئەو گرووپە دەستەبەر بكـات. لەوكۆمەڵگایەدا كە قازانجی تاك جیـاوازە لــە قــازانجی كۆمــەڵگا و بـارودۆخی پێشـكەوتنی تاكەكان لە دامەزراندنی پێوەندیی تایبەتی لەگەڵ دەســەلآتداراندا، مسـۆگەر دەبـێ نـەك لـە سەربنەمای بوونی رێكخراوگەلی جەماوەری، كە بەرپرسیاری دابینكردنـی قـازانجی زۆرینــە و پارێزەری مافی كەمینە بن، ئەوە كۆمەڵگایەكە كە، لـە گۆشـەنیگای سیاسـییەوە، ئــازادیی بیروباوەڕ، تەنیا لەچواچێوەی وەرگرتنی راوبۆچوونی هاوچەشن و هاوشێوە شكڵ دەگرێ و یاسا ئەخلاقی و ئازادییە تاكەكەسییەكان، لە باوەڕە زەینی و نەریتییەكاندا بناغــەیان داكوتـاوە و هاوڕەنگی خەڵك بوون، بەهێزترین ئامێری پێوەندییە.

### حكومەتی دیموكراتیك و ئازادی، بەرهەمی كام رەوتن؟

لەو كۆمەڵگایانەدا كە بەواتای راسـتەقینەی وشــە، دەسـتیان بــە ئــازادی راگەیشــتووە، دیموكراسی دەسكەوتی خەباتی جەماوەری بووە . خەباتی جەماوەری، لەسەر بنەمای شـێوازی ناتوندوتیژی، لە پێناو گۆڕینی پێكهاتە بنەڕەتییەكانی حكومەتی سەرەڕۆ و جێگۆڕكێی لەگەڵ بنەماگەلێكدایە كە هەڵگری دابەشكردنی دەسەلآتی سیاسییە لە ئاستی كۆمەڵگادا. خەڵك و رێبەرانی بزووتنەوە، بەڕوونی دەزانن كە لە نێوان بارودۆخی ئێستا (حكومەتی سـەرەڕۆیی) و بارودۆخی كۆتایی(سەقامگیری حكومەتی دیموكراسی) چ جیاوازیگەلێك هەیـە. ئامانجـەكانی

خەبات و تێکۆشان چییە و بۆ گەیشتن بەوان، دەبێ چ ڕێگایەك بگرینەبەر. شێوەی خەباتی مەدەنی بۆ خەڵك ڕوونە. پێوەری خەباتی جەماوەری بەدیهاتنی ئەو ئامانجانەیە کە خەڵك لەسەری ڕێکەوتوون، نەك گۆڕینی کەسایەتییەکان، هێماکان و سیمبوڵەکانی حکومەتی سەرەڕۆ. لە بەرانبەر کۆمەڵگایەکی وادا کە ڕێگای دامەزراندنی دیموکراسی هۆشیارانە دەپێوێ، لە کۆمەڵگا دیکتاتۆری لێدراوەکاندا، بنەمای خەبات ڕێبەری کاریزماتیکە، کە بە ورووژاندن و پێکهێنانی ئەنگیزە، تاکەکان بەرێگای ئارمانجگەلێکدا ڕێنوێنی دەکا کە بەهیچ جۆرێك دیمەنی کردەیی ئەوەیان بەزەیندا نەدەهات. وەها خەباتێك بەهیچ جۆرێك ئامانجی کۆتایی بۆخۆی دیاری نەکردووە، چوونکە بە ڕوونی جیاوازیی نێوان سەردەمی ئێستا و فۆڕمی نوێی حکومەتێك کە دەبێ دامەزرێ، نازانێ و چاکسازیی یان ئاڵوگۆڕ تەنیا لەئاستی گۆڕینی ڕواڵەت، هێماکان و نوێڵەکانی دەسەڵاتدا ڕوودەدات. لە بنەماکانی دیکەی ئەم خەباتە، هەڵسوکەوتی تایبەتی و لابردنی ناوەکان و کەسایەتییەکانە، نەك چاکسازی و جێگۆڕکێی شێوەکان.

## ڕێگەچارەی چەسپاندنی دیموکراسی چییە؟

حکومەتی دیموکراتیك، حکومەتی بەکۆمەڵایەتیکردنی دەسەڵاتی سیاسییە، بەو واتایەی کە لە کۆمەڵگای دیموکراتیکدا، بە پێچەوانەی حکومەتە سەرەڕۆ و سەرەتاییەکان، کە دەسەڵات تەنیا لە پاوانی تاك و گرووپی گرێدراو بەوانەوە بوو، دەسەڵات لە نێوان بنیادەکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا دابەش دەکرێت و لێپرسراوان بێپسانەوە لەژێر چاودێری خەڵکدان. ئەم دابەشکردنی دەسەڵاتە پێویستی بەخواست، هۆشیاری و هەست بە بەرپرسیارێتی کردنی خەڵکەکەیە. لە بەرانبەردا، لە کۆمەڵگا سەرەڕۆکاندا کە پێوەندی موراد و مورید (ئیرادە و ئیرادەکەر) لە نێوان دەسەڵاتداران وخەڵکدا دامەزراوە و خەڵك بەرلەوەی کە لە ئاستی ئەرك و مافەکانی خۆیان ئاگاداربن، لە پێکهاتەی کەسایەتیی ڕێبەرانی خۆیاندا تواونەتەوە، ئیتر ڕۆحی پرسیارگەری و چاودێری بوونی نابێ. حکومەتی سەرەڕۆ، حکومەتی چڕبوونەوەی دەسەڵات و دژایەتییە لەگەڵ هەرچەشنە بڵاوبوونەوەیەکی لە کۆمەڵگادا. دەسەڵات بنەمای کەسێتی دەسەڵاتدارانی سەرەڕۆیە، کە بەبێ ئەو شوناس و پێکهاتەی ژیانی سیاسیی ئەوان لە مەترسیدایە. هاووڵاتییانی کۆمەڵگایەکی وا خاوەن ماف و لێپرسراوییەکی دیار لە پێناو چارەنووسی خۆیان و چارەنووسی کۆمەڵایەتیی دیتران یان تەنانەت دەسەڵاتیشدا نین، چونکوو لەبنەڕەتدا خاوەن هیچ چەشنە دەسەڵات و توانایەك نین. لەم کۆمەڵگایانەدا، دەسەڵات تەنیا

کاتێـك دەستاودەسـت دەكـرێ كـە لـە راسـتای خزمـەت بەدەسـەڵاتی رەهـادا بـێ، نـە رێخۆشكەرییەك بۆ بەشـداریی لـەودا. (پـریكێلس)، یـەكێك لەسیاسـەتوانان وشـارۆمەندانی "ئەسینا" ۲۰۰۰ساڵ پێش ئێستا، گرنگیی لێپرسراویی سیاسی بەم شێوە دەناسـێنێ: "لێـرە هـەموو خەڵكەكـە نەتـەنیا هـۆگری كاروبارەكـانی خۆیـان، بـەڵكو هـۆگری كاروبارەكـانی حكومەتیشن، ئێمە ناڵێین كەسێك كە هۆگری سیاسەت نییە سەرقاڵی كاری خۆیەتی، بـەڵكو دەڵێین ئـەو هـەرگیز لێـرە كـارێكی نییـە. ئێمـە"ئەسـینا"ییـەكان، خۆمـان لەسـەر پرسـە سیاسییەكانمان بڕیاردەدەین."

## ئەركەكانی حكومەتی دیموكراتیك:

حكومەتی خەڵك سالار، حكومەتێكە كە بناغەكانی دەسەڵاتدارێتیی خۆی لەسەر بنەمای هێزی خەڵك پێك دێنێ. بەشێوەیەك كە هاوولاتییان بۆیان هەیە نوێنەرانی خۆیـان لەرێگـەی هەڵبژاردنێكەوە هەڵبژێرن كە ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت:

ئـازاد، رێكوپێـك، یەكسـان، بـێدەسـت تێـوەردان وتۆقانـدن، كـە تێكـڕای خـەڵك بـۆ بەشداریكردن تیایدا لەمافی دەنگدانی یەكسان وبەرانبەر سوودمەند بن.

١. حیزبی سیاسیی جۆراوجۆر لەو هەڵبژاردنەدا بەشداری دەكەن.

٢. سیستمی هەڵبژاردن لەلایەن رێكخراوە سەربەخۆكانەوە چاودێری دەكرێ و دەنگەكانی خەڵك دەپارێزرێت.

٣. هـەروەها حكومـەتی خـەڵك سـالار لـە بەرانبـەر خەڵكـدا، ئـەركی پشـتیوانیی و راپەڕاندنی ئەم خالانەی خوارەوەیە:

* پشتیوانی لەئازادییە تاكەكەسییەكان
* دەسەڵاتداریی یاسا لەسەر بنەمای سیستمی دادوەریی شیاو، بێ لایەن و سەربەخۆ
* پشتیوانی لە ئازادیی تێكۆشانی رێكخراوەكان وحیزبە سیاسییەكان

## كۆمەڵگای مەدەنی:

ریشەی بنەڕەتی شكڵ گرتنی كۆمەڵگای مەدەنی لەسەر ئەم بنەمایەیە كە دەسەڵاتداران و خاوەن هێزەكان، دەكرێ هەڵە بكەن و ئەگەری بە هەڵەدا چوون لەكارێكدا كە لەلایەن خەڵكەوە پێیان سپێردراوە لە ئارادایە. كەوابوو كردەوەی دەسـەڵاتداران پێویسـتە بەشـێوەی بـەردەوام

لەلایەن خەڵکەوە  تاوتوێ و پێداچوونەوەی لەسەر بکرێ. بە واتایـەکی دی، پێویسـتە خـەڵك بەشێوەی یاسامەند، هۆشیارانە و بێ نانەوەی ئـاژاوە و بـێ سـەرەوبەریی، هێـزی دەسـەڵات کۆنترۆڵ بکەن و پێویستە خۆیانیش پێگەی سـەربەخۆی نـاحکوومیی قانونییـان هـەبێت، بـۆ ئەوەی بەپشت بەستن بە ئەوان لە بەڕێوەبەری کاروباری حکومەتدا بەشداربن.

کۆمەڵگای مەدەنی بەشێوەی بەکۆمەڵ بەشداری هاووڵاتییان لە گۆڕەپانی گشتیدا مەیسەر دەکات، تا بەدەربڕینی هۆگری و بۆچوونەکانی خۆیـان، وێـڕای لەبەرچـاوگرتنی بەرژەوەندییـە گشتییەکان، دەسەڵات ناچار بەوەڵامدانەوە  بکـەن. بەواتایـەکی دی، کۆمـەڵگای مـەدەنیی پێکهاتوو لەرێکخراوە ناحکوومییەکان ئەم تایبەتمەندییانەیان لەخۆ گرتووە:

١. لەدەوڵەت جودان.

٢. توندوتیژی خواز نین.

٣. خۆڕسك و خۆبەخشانەن.

٤. سیاسەتەکانی حکومەت تاوتوێ و هەڵدەسەنگێنن.

٥. خاوەن پێکهاتەیەکی ئازادیخوازن.

ئەم رێکخراوە ناحکوومییانە بریتین لە گرووپەکان، ئەنجوومەنەکان، یانەکان، پیشـەوەران، سەندیکاکان، فیدراسیۆنەکان، یەکێتییەکان و. . . کە وێـڕای ئـەوەی کـە لـە هێـزی خـەڵك پێکهاتوون، لە راستیدا بەمەبەستی دروست کردنی نێونجیکەرێك لەنێوان حکومەت و خەڵکدا پێکدێن، کە ئەم کـارە دەبێتـە هـۆی بەشـداریی خـەڵك لەدەسـەڵاتی سیاسـیی حکومەتـدا. بێگومان حکومەتیش دەبێ دەرفەت بۆ بەشداری ئەوان بڕەخسێنێت و پشتیوانییان لێ بکات.

کۆمەڵگای مەدەنی بەستێنێکە بۆدەربڕینی بیروباوەڕە جیاجیاکـان، کـە بەچـاوی دوژمـن سەیری نەیارانیشی ناکات و ئامـادەی بیسـتنی راوبۆچـوونی ئەوانیشـە، بەواتایـەکی دیکـە کۆمەڵگای مەدەنی کۆمەڵگایەکی پلۆرالیزمە(زۆرینەخوازی).

بناغەی کۆمەڵگای مەدەنی لەسەر بنەماکانی خوارەوە قایمە:

١. مرۆڤ( کەسێتی راستەقینەی هاووڵاتییان).

٢. بنەمابوونی عەقڵ و هزر.

٣. رەسەنایەتیی پیشە و بایەخدان پێی.

٤. پابەندبوون بە یاسا(قانوونمەداری).

٥. رێزدانان بۆ بیروباوەڕی جیاواز.

کۆمەڵگای مەدەنی فۆڕمی "باو"ی پلەی دەسەلاّت دەگۆڕی و پێوەندیی یەکلایەنەی دەوڵەت لەگەڵ خەڵکدا بۆ پێوەندییەکی دوولایەنە دەگۆڕێ، بۆئەوەی دەسەلاّت لەهەموو ئاستەکانی کۆمەڵگادا بەشێوەی یەکسان دابەش بکرێت.

پێکهاتەی نوێ

| | | |
|---|---|---|
| دەوڵەت<br>(لە هەڵسەنگاندنی بەردەوامی خەڵك و ڕێکخراوە جەماوەرییەکان) | | |
| ڕێکخراوە جەماوەرییەکان | حیزبەکان | چاپەمەنییەکان |
| خەڵك | | |




پێکهاتەی"باو"ی پلەی دەسەڵات

## تایبەتمەندیی تاکەکەسیی هاوولاتیی کۆمەڵگای مەدەنی

لەخشتەی خوارەوەدا تایبەتمەندییە تاکەکەسییەکانی هاوولاتیی کۆمەڵگای مەدەنی، لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگا نەریتی و سەرەڕۆکاندا هەڵسەنگێندراوە.

| تایبەتمەندیی تاکەکەسیی هاوولاتیی مەدەنی | تایبەتمەندیی تاکەکەسی هاوولاتیی کۆمەڵگای نەریتی |
|---|---|
| متمانە بەخۆ | ئاتاج بەرزگاریدەرو قارەمان |
| بوێری لە رەخنە گرتن و دەربڕینی بیروباوەڕ | ترس و خۆسانسۆری |
| ئاوەزمەندی و پشتبەستن بەزانست | خورافە پەرستی و باوەڕ بەنەریتە چەوتەکان |
| باوەڕ بەوەی کە مرۆڤ، خۆی چارەنووسی خۆی بنیات دەنێ | باوەڕ بەقەزاوقەدەر و سەردانەواندن بۆی |

## ئەرکە کۆمەلآیەتییەکانی هاوولاتیی مەدەنی:

ئەرکە کۆمەلآیەتییەکانی هاوولاتی مەدەنی لە بەرانبەر خەڵکانی دیکەی کۆمەڵگادا دەتوانین بەمشێوەی خوارەوە شی کەینەوە:

* سەرنجدان بە ئەوانی دیکە و تێگەیشتن لێیان لەجێگەی خۆ پەسندی و خۆنواندن
* لەبەرچاوگرتنی مافی تاکەکانی دیکە لەجێگەی بەرژەوەندیخوازی خۆ
* وەرگرتنی بیروباوەڕی دژبەیەك لەجێگەی قبوولْ نەکردن
* هەڵکردن وقبوولکردنی دیتران لەجێگەی گرژیخوازی
* رێزلێنان لەمرۆڤایەتی و ئاوەزمەندیی دیتران لەجێگەی روانینی ئامێر ئاسا و نامرۆیی لە خەڵکانی دی.
* هەست بە بەرپرسایەتی کردن لە بەرانبەر خۆی و کۆمەڵگادا لەجێگەی لەخۆ دوورخستنەوە
* روانینی واقیع بینانە لە دیتران لەجێگەی قارەمان پەروەری یان سووکایەتیکردن پێیان.
* باوەڕ بەیەکسانی مرۆڤەکان لەجێگەی باوەڕ بەتاك سالاری.

## ئەركە سیاسییەكانی هاوولاتیی مەدەنی:

* حكومــەتی دیموكراتیــك، بەپێچــەوانەی رژێمــە ســەرەڕۆكان، بۆخزمــەت بــە خــەڵك پێكهــاتووە، بــەلاّم خــەڵكیش دەبــێ بــە یاســا و بەرنامــە خــەڵك ســالارییەكانی چەســپاو لەكۆمەڵگادا پاندبن.

* حكومەتە دیموكراتیكەكان ئازادییەكی زۆریان بۆ هاوولاّتیان لەبەر چاوگرتووە، بۆ وێنە: ئازادیی دژایەتی و رەخنــەگرتن لــە حكومــەت و لــە بەرانبەریشــدا هاوولاّتیــانی حكومــەتی دیموكراتیــك، دەبــێ لــە فەرهــەنگی بەشــداریكردن، دان بــەخۆداگرتن و ســەبر و تاقــەت سوودمەندبن.

* هاوولاّتیان لەوە ئاگادارن كە لە حكومەتی خەڵك سالاردا نە تەنیا مافیان هەیە، بەڵكو بەرپرسیاریەتیشــیان هەیــە. ئــەوان دەزانــن كــە پارێزگــاری و چــاودێری كردنــی حكومــەتی دیموكراتیك مافی ئەوانە و بۆ بەردەوامی حكومەتی دیموكراتیك و رێزلێنــان لــە مافــەكانیان، دەبێ بەرپرسیاریەتی كۆمەڵگا بگرنە ئەستۆی خۆیان.

* بۆ سەركەوتنی دیموكراتیك، پێویستە كە هاوولاّتیان ئەكتیڤ بن نە پاسـیڤ، چـونكوو سەركەوتن یان سەرنەكەوتنی حكومەت، لە ئەستۆی ئەواندایــە، نــەك كەســێكی دیكــە. لــە بەرانبەردا، دەسەلاّتدارانی حكوومیش دەزانن كە هەڵسوكەوت لەگەڵ هــەموو هاوولاّتییــان دا دەبێ بەرانبەر بێت و كردەوەی نایاسایی لە حكومەتی خەڵك سالاردا شوێنی نابێتەوە.

* لە سیستمێكی دیموكراتیكدا، خەڵكی ناڕازی لەبەرێوەبەرانی كۆمەڵگا، سەربەســتانە و بەهێمنی دەتوانن بارودۆخی گۆڕان پێك بێنن، یان لەكاتی هەڵبژاردندا بە كەسانێك جگــە لــە دەسەلاّتداران دەنگ بدەن.

* بۆ بەردەوامی حكومەتێكی دیموكراتیك، دەنگدانی وەختــاوەختی خــەڵك بــەس نییــە، بەڵكو سەرنجدان، بەرپرسیارێتی و بەڵێنی هاوولاّتییان رۆڵێكی گرنگی هەیە.

* لەحكومەتی دیموكراتیكدا، خەڵك دەچنە ریزی حیزبە سیاسییەكانەوە و بۆ سەركەوتنی نوێنــەرانی هەڵبــژێردراوی خۆیــانیش تێدەكۆشــن و تەنانــەت ئــازادن وەك پــاڵێوراویش لــە هەڵبژاردنەكاندا بەشداری بكەن، یان ماوەیەك وەكو بەرپرسانی هەڵبژێردراوی خــەڵك خزمــەت بكەن. ئەوان ئەم راستییە باش دەزانن كە لەوانەیە دەسەلاّت بەردەوام لەدەســت حیزبەكەیانــدا نەبێت.

* لەکۆمەڵگای دیموکراتیکدا، خەڵك بۆ دارِشتنی بابەتە خۆماڵی و نیشتمانییەکان، لە چاپەمەنییە سەربەخۆکان کەڵك وەردەگرن ودەبنە ئەندامی ئەو رێکخراوە تایبەتیانەی کە خۆبەخشانە چالاکی دەکەن، کە لەوانەیە ئەم رێکخراوانە سەبارەت بەئایین، کەلەپووری نەتەوەیی، توێژینەوەی زانستی، وەرزش، هونەر، وێژە، باشتربوونی بارودۆخی شوێنی ژیان، ئاڵوگۆڕی نێودەوڵەتی خوێندکاران یان زۆر بابەتی دیکە ئەکتیڤ بن. هەموو ئەم رێکخراو و گرووپانە بێ ئەوەی کە مەودایان لەگەڵ حکومەتدا گرینگی هەبێ، لە بایەخداربوون و باشتربوونی دیموکراسی کۆمەڵگادا بەشدارن.

* لەکۆمەڵگا نەریتییەکاندا، خەڵك وەکو دەسەڵاتدارێکی ستەمکار و چەوسێنەر چاو لەحکومەت دەکەن و بەنیازی خۆنزیك کردنەوە لەدەسەڵاتداران وئاڵوگۆڕی بیرورِا لەگەڵ ئەوان لەچوارچێوەی گرووپێکی قانونییدا نین، لەحاڵێکدا هاووڵاتیانی مەدەنی بۆ دروستکردنی پێوەندییەکی دوو لایەنە لەگەڵ حکومەتدا تێدەکۆشن و لەولاشەوە حکومەتیش بە پشتیوانی کردن لە گرووپە جەماوەرییەکان، کە سەربەخۆ لەحکومەت بەستێن بۆ بەشداریی خەڵك دەرِەخسێنێت.

* هاووڵاتیانی کۆمەڵگای مەدەنی، رەخنە لەدەسەڵات دەگرن وحکومەتیش سەرنج بە پێداویستی و خواستەکانیان دەدا، کەوابوو خواستەکانی خەڵکیش لەرەوگەیەکی دیاریکراودا دەگوازرێتەوە بۆ حکومەت.

* حکومەتیش بەشێوەیەکی شیاو بەرپرس و وەڵامدەرە، لەحاڵێکدا لەکۆمەڵگا دیکتاتۆرییەکاندا بەهۆی نەبوونی رێکخراوی مەدەنی و وەڵام نەدانەوەی دەسەڵاتداران، خواستەکانی خەڵك تەنیا لەرێگای سەرهەڵدان و ئاژاوەو شۆرِشەوە ئاشکرا دەبن.

## خستنەرِووی بەدیلێکی کردەیی بۆ شەرِ و شێوازی توندوتیژیی:

توندوتیژی لەکاری سیاسی و کۆمەڵایەتیدا لە شێوازی شەرِ، تیرۆر، سەرەرِۆیی، ناهەقی، تۆقاندن، کوشت و برِو. . . ئەمرِۆکە وەکو یەکێك لەگرفتە ترسێنەرەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتییە.

بەداخەوە تا ئێستا هەموو ڕێگاچارە پێشنیارکراوەکان بۆ پێشگیری لە بلاوبوونەوەی توندوتیژیی[1] و ڕواڵەتەکانی، ڕووبەڕووی شکست بۆتەوە.

یەکێك لەهۆکارەکانی شکست و ناکارامەیی ئەم ڕێگە چارانە، ئەوەیە کە زۆربەیان بێسەرنجدان بەم مەسەلە، واتا خستنەرووی پێشنیارێك بۆ لابردنی توندوتیژی_ئەگەر نەڵێین مەحاڵە بێ گومان زۆر ئەستەمە.

ئەم نووسراوە هەوڵێکە بۆناسینی ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی توندوتیژی، وەکو دیاردەیەکی گشتگیر لەنێوان کۆمەڵگا و پرسە سیاسییەکان وخستنەڕووی ڕێگەچارەیەك بۆ پێشگیری لەو ڕووداوە. لەم بوارەدا بەهەڵسەنگاندن و شیکردنەوە و لێکدانەوەی ئەم بابەتەوە خەریك دەبین کە لە چ بارودۆخێکدا دەتوانین کێشەکان بەشێوەیەکی کاریگەر، بێ کەڵك وەرگرتن لە زەبر و زەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی چارەسەر بکەین و ڕووتێکردن لە شێوازی توندوتیژی بەشێوەیەکی بەرچاو کەم بکەینەوە .

لەم بەستێنەدا پێویستیمان بە لێکدانەوەی بارودۆخێك هەیە کە لەو بارودۆخەدا، ناباوەڕی بە توندوتیژی و خۆبواردن لە بەکارهێنانی وەکو کەرەستەیەکی چارەسەری کێشەکان، بواری جێبەجێکردنی بۆ دەڕەخسێ. هەروەها دەبێ توێژینەوە لەسەر ئەم مەسەلەیە بکەین کە بۆچی هەنووکەش توندوتیژی لە ڕەهەندی بەربلاودا بەکاردێ و تەنانەت بۆچی لە هێندێ بارودۆخدا بۆ گەیشتن بە ئامانجی باشیش (وەکو ئامانجی خراپ)، توندوتیژی بەکاردێ و چۆن دەکرێ بەدەستکاری ریشەیی گرژیخوازی، بە پەنابردنەبەر شێوازەکانی ناتوندوتیژیخوازانە بەئامانج بگەین.

ئەم نووسراوە دوورە دیمەنێکی ساکار و دوور لە ئالۆزی پیشان دەدا و ئومێد دەکرێ بتوانێ بۆ چارەسەری گرفتی توندوتیژی و بەکارهێنانی لە ئاستی نێونەتەوەیی و پرسە سیاسییەکان، ڕێکارێکی باش پیشان بدات.

دەبێ بڵێین جۆراوجۆری بیروڕا لە پرسە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا حەتمی و لە زۆر بابەتیشدا شیاوە[1]. هێندێ ناتەبایی بە ئاسانی و بەشێوازگەلی سەرەتایی وەکو، وتووێژ،

(١) توندوتیژی لەم کتێبەدا بەمانای توندوتیژی فیزیکی لەبەرامبەر مرۆڤەکانی دیکەدا لەبەرچاو گیراوە کە بەشێوازی تۆقاندن، لێدانو وەبەرجنێودان، شەرو خوێنرێژییەوە دەبێتە هۆی برینداربوونو مردن. هەروەها هەرجۆرە هەڕەشەکردنێك بۆ بەکاربردنی توندوتیژیی فیزیکی یان هەر کردەوەیەك کە پێوەندی بەتوندوتیژیو هەرەشەوە بێت، بەمانای توندوتیژییە-ن

گفتوگۆ و ڕێککەوتنە دوو قۆڵییەکان بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیی هەردوولا چارەسەر دەکرێ.

ئەم ڕێکارانە لەو بابەتانەدا کارسازن کە ناکۆکییەکانی دوولایەن ریشەیی نەبن. ئەگەرچی چارەسەری ناکۆکییەکان بەشێوەی گفتوگۆ و وتوویژ، زیاتر لەوەی کە لەژێر کاریگەریی لێك تێگەیشتنی دوو لایەنی وتوویژکەردا بۆ لەبەرچاو گرتنی دادپەروەری بێت، لەژێر کاریگەریی توانای ڕێژەیی ئەوان دایە.

لەزۆربەی دوژمنایەتییەکان یان پێکدادانە ناتەباکاندا، وا هەستدەکرێ کە ئامانجەکانی هەردوولا لەمەترسیدایە. ئەم جۆرە ناتەباییانە، ناتەبایی گەلێکی قەیراناوین کە زۆرجار بەباوەڕی تاکەکان، هیچ ڕێگایەك بۆ چارەسەرکردنیان لەحاڵێکدا کە بەرژەوەندیی هەردوولا بپارێزێ بوونی نییە.

لە دوژمنایەتییە قەیراناوییەکاندا، لانیکەم یەکێك لە دوولایەنی دژبەر بۆچارەسەری کێشەکە، بەکەڵك وەرگرتن لەتوندوتیژی دژی لایەنی بەرانبەر، وەکو شێوازێکی کارامە و پێویست باوەڕمەندە و، وەك ڕێگاچارەیەك لەم میتۆدە دەڕوانێ بۆ گەیشتن بەئازادی، دادپەروەری، بیروباوەڕە ئایینییەکان، شارستانێتی یان بەرگریی لەخۆی. یان لەوانەیە لەو شێوازە وەکو ئامێرێك بۆسەپاندنی ناهەقی، نادادپەروەری، سەرەڕۆیی یان تەنانەت بۆ دەستدرێژی بە بنەماگەلی بڕوایی، ڕەوشتی و ئایینی، یان پێگەی مرۆیی لایەنی بەرانبەر یان تەنانەت هەڕەشە بۆ مانەوەی مرۆڤەکان کەڵك وەرگرێ.

لە ناتەباییە قەیراناوییەکاندا، یەکێك لە لایەنەکان بە کۆڵدان و ژێردەستیی یان تەنانەت بەرگریی وەکو کارەساتێك دەڕوانێ کە مەترسیی گیانیی بۆ هەموو کۆمەڵگا و یەك بە یەکی تاکەکان هەیە و لەسەر ئەم باوەڕەیە کە پێکدادان بەهەموو هێزەوە وەکو تەنیا ڕێگە چارە، پێویستە.

## بۆچی بۆ چارەسەری ناکۆکییەکان پەنا وەبەر توندوتیژی دەبەین؟

شەڕ و شێوازە جۆراوجۆرەکانی توندوتیژیی، بۆ پانتاییەکی بەربلاو لە ئامانجەکان بەکار هێنراوە. بەلام لە گەنگەشە قەیراناوییەکاندا، توندوتیژی لە سنووره سیاسی و

(١) لەراستیدا کۆمەڵگای مەدەنی توانای دەربڕینی بیروباوەری جیاواز پێك دێنێ و بریاردانیش لەسەر بناغەی هاتنەئارای بیرورای جیاواز دێتە ئاراوە-و.

دەوڵەتەتییەکاندا وەکو ئامرازێك بۆ ڕێز لێنان و گەیشتن بە ئامانج گەلێك کەڵکی لێوەردەگیریٚ کە بەرزتر و مەزنتر لێی دەڕوانردرێت. لەم ڕووەوە توندوتیژی لەروانگەی باوەڕدارانیەوە، بە بەربژارێکی گرنگ لە بەرانبەر بەربژارێکی دیکە سەیر دەکریٚ کە هەر هەمان گوێڕایەڵی بیٚ کاردانەوەییە. بەبڕوای ئەوان گوێڕایەڵی دەبێتە هۆی زەرەر و زیان پێگەیشتنێکی زۆر.

لە زۆربەی سیستمە سیاسییەکاندا، شەڕ و توندوتیژی وەکو"فەرمانێکی بیٚئەملا و ئەولا" حیسابی بۆ دەکرێت. لەم ڕووەوە شێوازە جیاجیاکانی توندوتیژی وەکو رێگە چارەی کۆتایی، کاریگەرترین شێوەی شیاوی جێبەجێکردن، ئامرازێك بۆ بەکارهێنانی فشار، بەدەستهێنانی پوان و بەئاگاهێنان، لە بەرانبەر رێکاری ناتوندوتیژی و مامناوەند دەناسرێت کە وەکو خالێکی ناکردەوەییانە و لە پێشدا شکست خواردوو لەبەرچاو دەگیریٚ. لەم قۆناغەدایە کە توندوتیژی وەکو شێوازێك بۆ بەدەست هێنان و گەیشتن بە هەموو باشییەکان و هیواکان لێك دەدرێتەوە. کاتێك ئەم بیروباوەڕە هاتەدی، ئیتر هیچ رێگەچارەیەك بۆ پاککردنەوەی توندوتیژی و شەڕ لەبیروباوەڕی خەڵکدا نامێنی و لە راستیدا لەم قۆناغەدا شەڕ خۆی دەبێتە ئامانجێك.

لە هەڵلاٚی دووبەرەکییە قەیرانی و ریشەییەکاندا، خێر و چاکەبینی و مشوو لیٚخواردن(تەنانەت وتووێژو گفتگۆکردن) بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەیەك بۆ دەربازبوون لەقەیران، وەکو کارێکی بیٚ کەڵك و بیٚ بایەخ لێك دەدرێتەوە و لەم قۆناغەدا دوولایەنی دژبەیەك، بەدەگمەن ئامادەن کە لە ئامانجەکانی خۆیان بیٚ بەکارهێنانی توندوتیژی بکشێنەوە و تیۆری"بورد-بورد"واتا (بردنەوە-بردنەوە) وەکو خالێکی ناپەسند لێکدەدرێتەوە.(1)

مێژووی مرۆڤایەتی شایەتی ئەم بابەتەیە کە لە رەوتی گەنگەشەکان وناکۆکییەکاندا، نارەزایەتیی ئەوانەی دژی توندوتیژی بوون نەیتوانیوە توندوتیژی لەناو ببات و خەڵکیش هیچ کاتێك شەڕ و میتۆدە جۆراوجۆرەکانی شەڕیان نەناوەتە لاوە، چونکە لەم باوەڕەدان (یان ئەم باوەڕە دەخەنە مێشکیانەوە) کە بیروباوەڕی جیاواز مەترسییەکە بۆ بایەخە کۆمەلاٚیەتی و ئایینیەکانی ئەوان. کاتێك بۆچوونێکی وا بخرێتە مێشکی خەڵکەوە، ئیتر واقیع بینانە نییە چاوەڕوانی رووداو و دژکردەوەی دوور لەتوندوتیژی بین.

---

(١) لەراستیدا دیکتاتۆرە ئاژەڵ سفەتو بەرێوەبەرانی قەتڵە مرۆڤایەتییەکان شیاوی ئەوە نین کەبە تیۆری"بورد-بورد"رازی بنو بە هێندیٚ لە ئامانجەکان دەستیان بگا، کەوابوو بەشەڕەنگێزی خۆیان درێژە دەدەن.

نزيك بە چڵ ساڵ پـێش ئێسـتا (Jerome D. Frank) جـیرۆم فرانـك پزیشـكی دەروون ناسـی، بـە دونیـای راگەیانـد ئاشـتی و رێككـەوتن لـەباوەڕی مرۆڤەكانـدا وەكـو بایـەخ و تایبەتمەندییە باشە ئەخلاقییەكان ناناسرێ.

خەڵك، گروپە جەماوەرییەكان و دەسەڵاتداران بەم هۆیەوە خۆ لە توندوتیژی نابوێرن كە ئەو ناكۆكییانە پرەنسیپ و باوەرەكانی كۆمەڵگای ئەوان دەخاتە مەترسییەوە، بەڵكو خۆ دوورگرتن لە توندوتیژی بە مانای كەم و كوڕی و دۆڕاندن دەزانن.

لە دوژمنایەتییە قەیراناوییەكاندا بۆ خۆبواردن لەشەڕ یان شێوازەكانی دیكەی توندوتیژی، وەكو دوایین رێگەچارە بۆ بەرگری لەبیروباوەڕ، كۆمەڵگا، ئامانجەكان، یـان تەنانـەت مانـەوە، دەبێ بەدیلێكی لەبار و گرفت رەتێن و چارەسەركەر بۆ توندوتیژی بخرێتە روو. ئـەم جێگـرەوە دەبێ بۆ لەناوبردنی قەیران و ناكۆكییەكانی هێز، كاریگەریی پێویستی ببێ و لە رێگای دەست راگەیشتن بە ئامانجەكان، بە بەراورد لەگەڵ شـێوە توندوتیژییەكانـدا، شانسـی یەكسـان یـان تەنانەت لەسەرتری هەبێ. بەناچار ئەم جێگرەوە دەبێ لە رووبەڕووبوونـەوە لەگـەڵ بارودۆخـە قەیراناوییەكاندا ــــ كە بە شێوازی نەریتیی تەنیا رێگە چـارەیان بـەكار هێنـانی توندوتیـژی بەهەژمار هاتووە ــــ كرداری و شیاوی جێبەجێبوون و جێگرەوەیەكی شیاو بـۆ توندوتیـژی و پێكـدادانی فیزیكـی بێـت، بـارودۆخێكی قـەیراناوی وەك رووبەڕووبوونـەوەی خـەڵك لەگـەڵ حكومەتـە سـەرەڕۆكان، دەسـت بەسـەرداگرتن(ئیسـتعمار)و دەسـت تێـوەردانی دەرەكـی، رەشەكوژی، بۆمبدانانەوە و كوشتاری مرۆڤەكان.

خاڵی سەرەكی كە نیشانەی لێهاتوویی و كردەیی بوونی ئەم جێگرەوانەیـە، ئەمەیـە كـە حكومەتە سەرەڕۆكان لە چڵەپۆپەی دەسەڵاتی خۆیاندا، بەستراونەتەوە بە سەرچاوەكانی هێـزی كۆمەڵگاوە، كە ئەم سەرچـاوانەش بەسـتراونەتەوە بەیارمـەتی رێكخـراوە جەماوەرییـەكان و پشتیوانیی خەڵكەوە كـە ئەگـەر ئـەم هاوكارییانـە بـەردەوام نـەبێت، قـەیران و ئاریشـە بـۆ دەسەڵاتداران پێش دێت. وردەكارییەكانی ئەم باسە لەقۆناغەكانی داهاتوودا شرۆڤە دەكرێت.

## رێگایەكی دیكە لەجێگەی شەڕ و ململانێ:

تێئۆدۆر روزاك دەڵێ: خەڵك بۆ بەدەسـتهێنانی مافـەكانیان تـەنیا بـۆ چـەند رۆژێـك روو دەكەنە شێوازی ناتوندوتیژی و لەبەرئەوەیكە ئاكامێكی لێ ناكەوێتـەوە، هانـا دەبەنـە بـەر شێوازی توندوتیژی كە بەدرێژایی مێژوو ئاكامێكی نەبووە .

ئەگەر بمانەوێت بۆ توندوتیژی و شەڕ جێگرەوەیەك لەبەرچاو بگرین ئەم جێگرەوە، ئەندێشەیە، کە لە سەر ریالیزم دامەزراوە. زۆرجار ئەم خاڵە لەبیر دەکرێت کە شەڕ و توندوتیژی، وەکو رێگەچارەیەکی گشتی و گشتگیر بۆ چارەسەری قەیرانەکان لەجیهاندا نەبووە.

لەسەدەکانی رابردوودا، لە فەرهەنگە جۆراوجۆرەکاندا، هێندێ جار بۆ چارەسەری قەیرانەکان لەجێگەی بەکارهێنانی توندوتیژی جێگرەوەگەلێکی دیکەش بەکار براوە . ئەم جێگرەوانە لەسەر بنەمای ئەم بیرە نەبووە کە ئەگەر کەسێك زللەی لەگۆنای راستت دا گۆنای چەپیش بێنە پێشەوە" بەڵکو لەسەر بنەمای بەرەنگاری و راوەستاوی بەهێزانە لە بەرانبەر دەسەڵاتدارانی سەرەڕۆدا بووە.

بەدرێژایی مێژوو لە زۆرێك لە دوژمنایەتیکردنەکاندا، هێندێ لە لایەنە تووشبووەکان لە جیاتی توندوتیژی، بە پەنابردنەبەر رێگەچارەی دەروونی، کۆمەڵایەتی، ئابووری یان سیاسی یان تێکەڵاوێك لە رێگەچارەکان، چوونەتە شەڕی لایەنی بەرانبەریانەوەو سەرکەوتووش بوونە. ئەم رێگەچارانە لە هێندێ بابەتدا کە کێشەکان لاوەکی و بچوك بوونە، یان لەبەرەنگاری لەبەرانبەر دوژمنانی بێمەترسیدا، بەکار نەهاتوون. ئەم ستراتیژییە توندوتیژی نەخوازانە وەکو جێگرەوەیەك بۆ رێگەچارەگەل توندوتیژی خواز لەو دوژمنایەتیکردنانەدا کە ئامانجی دوو لایەن لە مەترسیدا بووە، یان لە بەرانبەر دوژمنانێکدا کە ئامادەی چەوساندنەوە و هەر توندوتیژییەك بوونە(وەکو لێدان وکوتان، گرتنی کاتی، زیندانیکردن وهتد)بەکار هاتوون.

سەرەڕای سەرکوتگەرییەکان، لە هێندێ بابەتدا گرووپە بەرگریکارەکان کە بەشێوەی ناتوندوتیژی بەرەنگاری دوژمن بوونەتەوە، سەرکەوتوو بوونە.

ئەم شێوە خەباتە، خەباتی ناتوندوتیژییە کە لە دوژمنایەتیکردنە قەیراناوییەکاندا جێگرەوەیەکی باشە بۆشەڕ و شێوازەکانی دیکەی توندوتیژی.

## نموونەگەلێك لە خەباتی ناتوندوتیژی:

خەباتی ناتوندوتیژی بەدرێژایی مێژوو، لە فەرهەنگ و بارودۆخە جۆراوجۆرە سیاسییەکان، لە وڵاتە رۆژاوایی و رۆژهەڵاتییەکان، لە وڵاتە پێشکەوتووە پیشەسازییەکان و دواکەوتووەکاندا، روویداوە. لە بەرانبەر ئیمپراتۆرییەکان، دیکتاتۆرەکان، کۆلۆنیالیزمی(ئیستعمار) دەرەکی یان تەنانەت حکومەتە دێموکراتە قانونییەکاندا، خەباتی

ناتوندوتیژی بە نوێنەرایەتی لە هەزاران کەس، بەهەزار هۆ __ تەنانەت هۆکـارگـەلێکیش کـە زۆرێك لە خەڵك لەگەڵیدا دژایەتییان بووە__ رووی داوە. ئەم میتۆدە لە ئاقاری پێشگیری یان پەرەپێدان و چاکسازیی بەکار هاتووە و لە هێنـدێ بابەتیشـدا، پـەنای بردۆتـە بـەر خـەباتی توندوتیژانە(هەڵبەت بەشێوەی زۆر سنووردار). درێژەی ئەو نیقاشانە کە لەواندا ئەم خەباتانـە شکڵیان گرتووە، زۆر جۆراوجۆر بوونە و هەڵگری دووبەرەکییە کۆمەڵایەتی، ئابووری، نەژادی، ئایینی، نەتەوەیی، رەگەزپەرەستی یان سیاسی__ بە شێوەی لاوەکی یان ریشەیی و بنـەڕەتی__ بووە.

ئەگەر چی ئەم شێوە لە خـەبات لەمێـژە بـوونی هەیـە، بـەڵام زۆربـەی مێژوونووسـان و مێژووناسـان ئـەم تێکۆشـان و خەباتانـەیان نەنووسـیوەتەوە و بێگومـان بەشـێکی زۆر لـەم خەباتانە، لە لابەلای لاپەڕەکانی مێژوودا ون بوونە، یان ئەگەر لە هێندێ بابەتـدا مابێتـەوە، لەبیر کـراوە. بەشـێکی کـەم لـەم نموونانـە دەگەڕێتـەوە بـۆ کێشـەی نێـوان حکومەتـەکان، دەسەڵاتدارانی ولاتەکان و کاربەدەستانی حکومەت و زۆربەیان دەگەڕێنەوە بۆ ئـەو بەشـە لـە خەڵك کە لە بەرانبەر دەسەڵاتداراندا، دەستەوداوێنی ئەم شێوازانە بوونـە، وەکـو زۆرێـك لـە خەبات و مانگرتنە کرێکارییەکان کە بـۆ بەدەسـتهێنانی مافـە کۆمەڵایـەتی_ئابوورییـەکان دروست بوونە. ئەم شێوە خەباتانە لە هێندێ بابەت وەکو دووبەرەکییـە نەتـەوەیی، نـەژادی، ئایینەکان یان تەنانەت مانگرتنە خوێندکارییەکانیش کەڵکی لێ وەرگیراوە . لـە نموونەگـەلی دیکە، دەتـوانین بـە پرۆتێسـتۆ(نارەزایـەتی) و دژایـەتیی خـەڵك بـە پەنابردنەبـەر شـێوازی ناتوندوتیژی لە بەرانبەر دەسەڵاتداران و هێندێ جاریش هێزە نزامییەکان ئاماژە بکـەین. لـە درێژەدا هێندێ لەم نموونانە باسکراوە.

لە سەدەی هەژدەهەمەوە تا ئێستا شێوازی خەباتی ناتوندوتیژی لەزۆرێك لە دووبەرەکی و قەیرانەکاندا بەکار هاتووە" راپەڕینی ولاتە کۆلۆنیالیزم(داگیرکراو)ەکـان، دوژمنایەتییـە نێـو نەتەوەییە سیاسی و ئابوورییەکان، خەباتی ئایینی و خەبات دژ بە کۆیلەداری.

ئەم میتۆدانە بۆ پاراستنی مافی ژنان، کرێکاران، مافی دەنگدانی پیاوان و ژنـان یـان، بـۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی گەلان، بەرژەوەندیی ئابووری، پێشگیری لە رەشـەکوژی، رووخـانی حکومەتە سەرەڕۆکان، یان چەوسێنەرەکان، بەدەستهێنانی مافی هاووڵاتی بوون، پێشگیری لـە رەگەزپەرستی، خەبات دژبە کودەتاکان و. . . هتد بووە.

یەکێك لە شێوازە باوەکانی ئـەم شـێوە خەباتگەلـە، مـانگرتن وگـەمارۆ ئابوورییـەکانی فیدراسیۆن وگرووپەکانە کە لەزۆربەی ولاتەکاندا بەڕێوە دەچێ.

یەکێك لە نموونە کردەییەکانی ئەم شێوازگەلە، لەسەرەتای سەدەی بیسـتەم، لـە شۆڕشـی رووسیا لەساڵی ١٩٠٥ی زاییندا رووی داوە .

چین لەساڵەکانی١٩٠٨و١٩١٥و١٩١٩ی زاییندا گەمارۆی ئابووری خسـتە سـەر هـەموو بەرهەمـەکانی ولاتـی ژاپـۆن(یابـان). ئالمانییـەکان لەسـاڵی١٩٢٠ی زاییـنیـدا شـێوازی ناتوندوتیژییان دژ بە پیلانگێڕانی ك. ا. پ. پ بەکارهێنا، کە مەبەستیان لابردنی حکومەت بوو و، لە ساڵی"١٩٢٣ی زایینی" شدا هەر ئەم شێوازەشیان دژ بە داگیرکـەرانی فەرەنسـی و بەلژیکی بەکار هێنا. لە دەیەی١٩٢٠تا١٩٤٥ی ز. لە زۆربەی ولاتـە ئەورووپییـەکانی وەکـو نۆروێژ، دانیمارك و هۆڵەندا، خەڵك شێوازی خەباتی ناتوندوتیژییان دژ بەداگیرکاری نازییەکان و یاسا گەلێك بەکار هێنا کە ئەوان دایان نابوو. وێنـەی ئـەم شـێوازگەلە بـۆ پێشـگیری لـە کوژرانی جوولەکەکان لە کوشتارگەکانی هیتلەرو دیاردەی هۆلۆکۆست لە زۆربـەی ناوچـەکانی ئەورووپایی وەك بولغارستان و دانیمارك و بەرلین بەکار هـاتووە. دیکتـاتۆرە سـەربازییەکانی ئەلسالڤادۆر و گواتیمالا لەبەهاری١٩٤٤ی ز. دا بەم شیوازە لەسەر حکومەت لابران. خەباتی کۆمەلایەتی دژ بە ئاپارتایـد(جیاکردنـەوەی نـەژادی) لـە دەیـەکانی١٩٥٠و ١٩٦٠ی ز. لـە باشووری ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بووە هۆی گۆڕینی زۆرێـك لـە یاسـاکان و دانـانی سیاسەتی نوێ.

لە ئابریلی١٩٦١ی ز. دا نارەزایەتیی چەکدارانی فەرەنسی جێگیر لە ئەلجەزایر بە شێوازی خۆپاریزی لە هاوکاریی لەگەڵ سوپادا کـە بـە خۆپیشـاندانی خـەڵکی فەرەنسـا و لایـەنگری حکومەتی ژنراڵ دووگوڵ پشتیوانی دەکرا، پێشی بە بەرێوەچوونی کوودەتا لە ئەلجەزایر گرت. ئەم هەوڵدانە لە راستیدا هەنگاوێك بوو بۆ پێشگیری لەکوودەتای هاوشێوە لە پاریسدا.

دوابـەدوای پـەیمانی ئیسـتعماری وەرشـۆ لـە سـاڵەکانی١٩٦٨و١٩٦٩ی ز. ، خـەڵکی چیکۆسلۆڤاکی بەشێوەی خۆڕسك بۆماوەی ٨ مانگ بە پشت بەسـتن بەشـێوازی ناتوندوتیـژی، وەکو خۆپاراستن لە هاوکاری و مانگرتن، کۆنترۆڵی ولاتیان لـە دەسـت دەسـەلات بەدەسـتانی حکومەتیی یەکێتیی سۆڤیەت دەرهێنا. لە١٩٥٣تا١٩٩٠ی ز. لەولاتـە کۆمۆنیسـتییەکانی ئەورووپای رۆژهەلاتدا بەتایبەت ئەلمانیای رۆژهەلات، لە هێستان، مەجارستان و کۆمارەکانی

بالّتيك بەشێوەی بەربلاّو و بیّپسانەوە نارِەزايەتيى نەياران بۆ بەدەستهێنانی ئـازاديی زيـاتر پەرەی گرت.

خەڵكی پۆڵەندا لـە سـاڵی١٩٨٠ی ز. داخوازييـەكانی خۆيـان بـۆ ئـازاديی فيّدراسـيۆنە پيشەييەكان بەبەرنامەريّژييەكی ريّكوپيّك و مانگرتنيّكی بەربلاّو راگەيانـد. لەكۆتاييـدا ئـەم خەباتە بە رووخانی حكومەتی كومۆنيستی تەواو بوو. خەباتی جەماوەری و ناتوندوتيژی لـە ولاّتانی چيكوسلۆڤاكيا، لـە سـاڵی١٩٨٩ی ز، ئاڵمانيـای رۆژهـەلاّت، ليتوانيـا و ئيّسـتۆنی لە(١٩٩١ی ز)شدا، كۆتايی بە دەسەلاّتی سەرەڕۆيی كومۆنيست هيّنا.

لە ساڵیّ١٩٩١ی ز. هەوڵەكان بۆ پيّكهيّنانی "گاردی ئاسـنی"لەمسـكۆ، بەنارِەزايـەتی و خۆپاراستنی خەڵك لە هاوكاری كردنيان رووبەڕووی رووخان بووەوە.

نارِەزايــەتی و خــەباتی ناتوندوتيــژی خــەڵك دژ بەسياســەتی جياكردنــەوەی نــەژادی و بالاّدەستيی سپی پيّستەكان لە ئەفريقيای باشوور لەماوەی ساڵەكانی١٩٥٠تا١٩٩٠ی ز، بـوو بەهۆی هەڵوەشانەوەی ياسای جياكردنـەوەی نـەژادی. حكومــەتی ديكتـاتۆری مـاركۆس لـە فيليپين لە ساڵی ١٩٨٦ هەربەم شيّوە رووخا.

لە مانگی جـولای و ئـابی١٩٨٨ ديموكراسـيخوازانی بيّرمـە، بـە ريّپيّـوان ونارِەزايـەتيی بەربلاّوی خۆيان، سیّ كەس لە كاربەدەستانی حكومەتييان ناچار بە دەست لە كـار كيّشـانەوە كرد. ئەگەرچی لەكۆتاييدا خەباتەكە بەكوودەتا و كوشتاری نيزامی كۆتايی پيّهات.

لە ساڵی١٩٨٩ی ز. خويّندكارانی چينی و هيّندیّ لە خەڵك لە زياتر لە٣٠٠شاردا(بۆنموونە تيـانئـانمـيّن لەپـەكين) ريّبەرايـەتی نارِەزايەتييــە سـومبۆليكەكانی دژ بــە گەنـدەڵی و چەوساندنەوەكانی حكومەتيان وەئەستۆ گرت، هەرچەند ئەم نارِەزايەتييانە بيّجگە لە كوشتاری نيزامی ئاكاميّكی لیّ نەكەوتەوە.

لەكۆسۆڤۆ خەڵكی بە رەچـەڵەك ئاڵبـانی لـە مـاوەی سـاڵەكانی١٩٩٠تـا١٩٩٩ی ز، بـە بەرنامەرِيّژييــەكی ريّكوپيّــك و بەگــەمارۆ و خۆپاراســتن لــە هاوكـاری، نارِەزايــەتيی خۆيـان لەهەمبەر ئەو ياسا چەوسيّنەرانە كە لەلايەن سرِبەكانەوە دانرابوو دەربرِی. كاتيّك حكومــەتی نافەرمی كۆزۆڤۆ نەيتوانی ستراتيژييەكی ناتوندوتيژانــە بـۆ بەدەسـت هيّنـانی رەوايـی خـۆی بەرهەم بيّنیّ، سوپای رزگاريدەری كۆزۆڤۆ ناچار رووی كردە شيّوازگەلی توندوتيژانە. ئەم كارە بەكوشت و كوشتار و سەركوتكاری سربەكان بەناوی"پاكتاوكردنی قەومی" دريّژەی كيّشا، كە سەرەنجام بووە هۆی دەستتيّوەردانی سەربازی ناتۆ.

له مانگی تشرینی دووه‌می ١٩٩٦ی زایینیدا، سربه‌كان نارِه‌زایه‌تی و خۆپیشاندانه به‌رده‌وامه‌كانی خۆیان به‌شێوازی به‌ربلاّو دژ به‌حكومه‌تی سه‌ره‌رِۆی سه‌ركۆمار میلۆسۆڤیچ له بلگراد و باقی شاره‌كان رێخست، كه له كۆتاییدا به‌رِێوه‌چوونی هه‌لّبژاردنێكی رێكوپێك و دوور له ساخته‌كاری، له ناوه‌راستی مانگی كانوونی دووه‌می١٩٩٧ی زایینی دا به‌دواوه بوو.

له‌و كاته‌دا دیموكراسیخوازانی سربی به‌هۆی نه‌بوونی ستراتیژی و به‌رنامه‌یه‌كی رێكوپێك بۆ خه‌بات، نه‌یانتوانی نارِه‌زایه‌تییه‌كانی خۆیان به‌ربلاّوتر بكه‌ن و بۆ لابردنی دیكتاتۆرییه‌ت و سه‌ره‌رِۆیی میلۆسۆڤیچ سه‌ركه‌وتوو نه‌بوون. به‌لاّم بزووتنه‌وه‌ی به‌رخۆدان و دیموكراسیخوازان، له سه‌ره‌تای مانگی تشرینی یه‌كه‌می سالّی٢٠٠٠دا. به به‌رنامه‌یه‌كی دارِێژراو و رێكوپێك ده‌ستیان دایه به‌ربه‌ره‌كانیێ له‌گه‌لّ میلۆسۆڤیچ، كه له كۆتاییدا توانییان حكومه‌ته سه‌ره‌رِۆكه‌ی ژێروژوور كه‌ن.

له سه‌ره‌تای سالّی٢٠٠١دا "ئێستراد" سه‌ركۆماری فیلیپین كه به گه‌نده‌لّیی دارایی تاوانبار كرابوو، به خه‌بات و تێكۆشانی خه‌لّكی ئه‌و ولاّته، ناسراو به "هێزی خه‌لّكی" له‌سه‌ركار لابرا.

له‌م قۆناغه‌دا بۆ ناسینی چۆنیه‌تی به‌رِێوه‌بردنی ئه‌م خه‌باتانه و شێوازی به ئاكام گه‌یاندنیان، پێویسته تایبه‌تمه‌ندی ئه‌م شێوازه له خه‌بات تاوتویێ كه‌ین كه ناوه‌رۆكێكی ناتوندوتیژانه‌یان هه‌یه.

## نیشانه‌كان و شێوازه‌كانی خه‌باتی ناتوندوتیژی:

خه‌باتی ناتوندوتیژی ده‌توانین به‌م شێوه پێناسه بكه‌ین: خه‌بات و به‌ره‌نگاربوونه‌وه‌ی خه‌لّك به شێوازی بیێتوندوتیژیی كه تێكه‌لّه له‌گه‌لّ فشار خستنه سه‌ر ده‌سه‌لاّت. ئامانج له‌م خه‌باتانه جێبه‌جێكردنی هێندیێ چاكسازی و قانون یان پێشگیری له جێبه‌جێكردنی هێندێكی دیكه‌یه.

ئه‌م فشارانه له به‌رانبه‌ر ده‌سه‌لاّتێكدایه كه خاوه‌ن رێكخستن، هێز و سه‌رچاوه‌ی جۆراوجۆره كه له‌وانه‌یه به سه‌ركوتكردن، په‌رچه‌كردار نیشان بدا.

شێوازی خه‌باتی ناتوندوتیژی شێوازێكی گشتییه بۆ رێنوێنی كردنی نارِه‌زایه‌تی، به‌ره‌نگاری و ده‌ستتێوه‌ردان له كاروباری سیاسی به دوور له توندوتیژیی فیزیكی.

ئه‌م شێوازه له‌سه‌ر بنه‌مای سیێ رێباز(رێچكه)ی گشتی داده‌رِێژریێ:

ئـ) خۆبواردن: کە بەشداربووان لەو چالاکییانەی کە زۆرجار ئەنجامی دەدەن_یان چاوەڕوان دەکرێ ئەنجامی بدەن یان لەلایەن قانون یان "عادەت"ی کۆمەڵگاوە دەستنیشان کراوە و دەبێ ئەنجام بدرێ_خۆدەبوێرن.

ب) ئەنجامی چالاکییە ئامانجدارەکان: لەم شێوازەدا بەشداربووان چالاکییەك ئـەنجام دەدەن کە جاران ئەنجامیان نەدەدا_ یان چاوەڕوان ناکرێ ئەنجامی بدەن_ یان لە روانگەی یاسا، رێسا و عادەتی کۆمەڵگاوە ئەنجامیان قەدەغە کراوە.

پ) تێکەڵاو: پێکهاتوو لە هەردوو رێگەچارەکان.

ئەم شێوازە خۆی بریتییە لە شێوازگەلێکی تایبەت کە بە سێ دەستەی سەرەکی گـرووپ بەنـدی بوونـە:١. نارەزایـەتی نانـەوەی ناتوندوتیـژ ٢. خۆبـواردن لـە هاوکـاری کـردن، ٣. دەست تێوەردانی ناتوندوتیژی. لە راسـتیدا شـێوەی خـەبات لەسـەر بنـەمای یـەکێك لەسـێ "رێباز"ی باسـکراوی(پ،ب،ئـ)و رەچـاوکردنی یـەکێك لەسـێ شـێوازی(١و٢و٣) گەلاڵـە و دەستنیشان دەکرێ.

ئەم سێ شێوازە وەکـو تـەوژمی فشـاری ناتوندوتیـژی و لـە بنـەمادا جێگرەوەیـەکن بـۆ توندوتیژی. نموونەگەلێك لەمیتۆدە جۆراوجۆرەکانی هـەرگرووپێك دەکـرێ بـەم شـێوە شـرۆڤە بکرێت.

یەك_خەباتە هێمادار ونارەزایەتییە سیمبولیکەکان_ وەکـو رێپێوانـەکان، بلاوکردنـەوەی راگەیەنراو و شەونامەکان، لەبەرکردنی جل و بەرگی یەکڕەنگ و لە شێوەی یەك_بۆ نیشاندانی یەکگرتوویی جەماوەری بۆ بە ئامانج گەیشتن.

دوو_خۆپاراستنی خەڵك لە درێژەدان بە هاوکاری لەگەڵ دەسەلات، یان بنیادنانی هاوکاری بەشێوەیەکی دیکە کە لە قاڵبی میتۆدگەلی کۆمەلایەتی، ئابووری یان سیاسیدا بێ. بۆنموونـە خەباتکارانی جەماوەری بۆ دووری کردن لە هاوکاری لە بابەتە کۆمەلایەتییەکاندا، دەسـتیان داوەتـە بـایکۆتی هەڵبژاردنـەکان و بەشـداری نـەکردن لـە جڤاتـەکان، کۆبوونـەوەکان و رێکخراوگەلێك کە بە جۆرێك بە دژبەرانی خەڵك و بەستراوەکان بە حکومەتەوە بەستراونەتەوە، یان لە شێوازە ئابوورییەکاندا لە کڕین وفرۆشتنی هێندێ لە کەلوپەلـەکان یـان گواسـتنەوە و دابەشـکردنی هێنـدێ لەشـتومەك و خزمەتگوزارییـەکان خۆیـان پاراسـتووە. هێنـدێ لـە کاربەدەستانی حکومی بۆ بەرنگاری لەگەڵ ولاتانی دژبەردا، گەمارۆی ئابوورییان سـەپاندووە

بەسەریاندا. ئەمانە جۆرێك لە بایكۆت، دووری لە هاوكـاری و خـەبات بـە پشـت بەسـتن بـە شێوازی ئابوورین.

خەباتی كرێكاران وگرووپە كرێكارییەكان شـێوازی جۆراوجـۆری بـووە، لەوانـە مانگرتنـە سەمبۆلیكە ماوە كورتەكان، مانگرتن لە شوێنە پیشەسازییەكان، مانگرتنە سەرانسەرییەكان یان وەستانی چەرخی پیشەسازی و ئابووری یەك شار یان هەموو ولاٌت.

خەباتی سیاسی لە شێوەی بـایكۆتی هەلٌبـژاردنی دەسـتكرد، قـەبوولٌ نـەكردنی رەوایـی دەسەلاٌت، نافەرمانی نهێنی، خۆبواردن لە هاوكاری لەگەلٌ فەرمانبەران ودەست و پێوەندەكانی دەولٌەت و نافەرمانی هاوولاٌتیان لە یاسای بیٌبناغە و "نزم"ی رژێمەوە دەردەكەویٌ.

سـیٌ _ دەسـتتێـوەردانی چـالاكانە و لەكارخسـتنی چـەرخەكانی كـردەوەی پێكهاتـەی دەسەلاٌت بە پشتبەستن بە شێوازگەلی دەروونناسانە، كۆمەلاٌیەتی، سیاسی و كردەیی. هێندیٌ لەم شێوازی خەباتە بیٌتوندوتیژانەیە بریتییە لە كۆبوونەوە لە شوێنی كار و ناوەندی كارگێڕی، كۆبوونەوە لەشەقامەكان، مانگرتن لەخواردن، بنیاتنانی سەنتەری ئابووری نویٌ، داگیركردنـی ناتوندوتیژ، هەولٌ بۆ رزگاركردنی زیندانییەكان یان بنیاتنانی حكومەتی جەماوەری هاوتەریب لەگەلٌ دەولٌەتی هەنووكەیی كە بەستراوەتەوە بە حكومەتی سەرەڕۆوە.

شێوازەكانی خەباتی ناتوندوتیژی لەسەربنەمای جۆری كردەوەی جێبەجێكراو و سـتراتیژیی رەچاوكراو پێناسە و پۆلێنبەندی دەكـریٌ، نـەك لەسـەر بنـەمای بیروبـاوەڕ و ئـەنگێزەی ئـەو كەسانەكە ئەنجامی دەدەن.

خالٌی زۆر گرینگ ئەوەیە كە، ئەم شێوازگەلە لەلایەن خـەلٌكی ولاٌتـە جیاجیـاكانـەوە بـە شێوازی بیركردنەوە و عادەتی جۆراوجۆر بەڕێوە چووە، ئەم بابەتە پیشان دەدا كە خۆبواردن لە توندوتیژی پێویستی بە باوەڕمەندبوون بە باوەڕگەلی تایبەت لەسەر بنەمای باشكردنی ئاكار و رەوشت، یان بنەما ئایینییەكان نییە. خۆبواردن لـە توندوتیـژی لەسـەر بنـەمای بیروبـاوەڕی ئایینی گوتارێكی جیاواز لە خۆبواردن لـە توندوتیـژی لـە خـەباتی جەماوەریدایـە. زۆرجـار، بەشداربووانی ئەم خەباتگەلە و رێبەرانیان بەم هۆیە لە توندوتیژی خۆیان بواردووە كە بەڕاستی بە ناكاریگەربوون و تێكدەربوونی باوەڕیان بووە، ئەگەرچی خۆبواردن لە توندوتیژی لە روانگەی ئایینی و ئەخلاقییەوە لەسەر بنەمای بیروباوەڕ و كردەوەگەلێكە كە بـە شـێوازی جۆراوجـۆر، كردەوەی توندوتیژانە رەت دەكەنەوە. لە هێندیٌ لەباوەڕە بڕوایی(عەقیـدەتی)ەكانـدا، نەتـەنیا توندوتیژی فیزیكی قەدەغە كراوە، بەلٌكو دوژمنایەتی هزری و گوتاریش ئیزنی پـیٌ نـەدراوە.

هەروەها ئەم ئایدۆلۆژیاگەلە خەڵك بۆ هەڵسوكەوتی ناتوندوتیژی لەگەڵ دژبەراندا هاندەدەن، یان تەنانەت وێناكردنی دوژمنایەتی نانەوە و بوونی دژبەرانیش رتدەكەنەوە. لەوانەیە باوەڕمەندان بەم باوەڕگەلە لەگەڵ خەبات و بەربەرەكانێی ناتوندوتیژی خەڵكدا لەم سۆنگەوە هاوكاری بكەن كە بە لایەنی باوەڕیی خۆیان بگەن. (مەبەست ئەوەیە كە بۆ ئەوان خود (نەفس)ی خەباتەكە گرنگترە لە ئامانجەكە).

## بە هەڵە تێگەیشتنەكان:

لەبارەی خەباتە ناتوندوتیژییەكانەوە پانتاییەكی بەربلاو لە بەهەڵە تێگەیشتن و چەمكی ناڕاست هەیە كە رووكردن بەم شێوە خەباتانە و تێگەیشتنێكی راست و دروستی لێیان رووبەڕووی قەیران كردۆتەوە. هێندێ لەم بە هەڵەتێگەیشتنانە بە شێوەی خوارەوەیە:

* زۆرجار تێگەیشتن وایە كە شێوازە توندوتیژییەكان زۆر زوو بە ئاكام دەگا و كاتێكی كەمی بۆ گەیشتن بە مەبەست پێویستە و لە بەرانبەردا شێوازی ناتوندوتیژی كاتێكی زۆر دەوێ. ئەم جۆرە بیركردنەوانە هەڵەیە، چونكوو لە هێندێ بارودۆخدا، دەستكەوتێك كە لە خەباتی ناتوندوتیژیدا بەدەست دێت، بە شیوازی توندوتیژانە بە دەست نایەت.[1]

* زۆركەس لەسەر ئەو باوەڕەن كە توندوتیژی نەنواندن نیشانەی لاوازییە و لە كردەوەشدا ئاكامی نابێ. لە حاڵێكدا ئەم میتۆدە دەتوانێ زۆر بە هێز و سەركەوتوو بێت و تەنانەت رژێمی سەرەڕۆ و سەركوتگەر شەلەل بكات و لەئاكامدا لەبەریەك هەڵوەشێنێتەوە.

* میتۆدی خەباتی ناتوندوتیژی پێویستی بە رێبەرێكی كاریزماتیك و خاوەن كەسایەتییەكی راكێشەر و رواڵەتی نییە.

* شێوازی خەباتی ناتوندوتیژی میتۆدێكی رووبەڕووبوونەوەی فەرهەنگییە.

---

(١) وەكوو شێوازێ كە گاندی بۆ پێشگیری لە كوشتاری موسوڵمانەكان بە دەستی هیندووەكانو سیكەكان لە بەمبەئیدا بەكاری هێنا. گاندی هەڕەشەی كرد كەئەگەر خەڵك لەبراكوژی دەست هەڵنەگرن تا بمرێ رۆژوو دەگرێ. لەحاڵێكدا دەڵەتی تازە بنیات نراوی هێند بەیارمەتی هێزەئەمنییەتییەكانی بریتانیا لەكونترۆڵكردنی خەڵك دەستەوەستان مابوون، شێوازی گاندی وەڵامدەر بووو خەڵك لەكوشتو كوشتاری ئائینیو نەژادی دەستیان هەڵگرتو دەستە دەستە دەرۆیشتن بۆ دیداری گاندی. بەنەقڵ لەكتێبی "ئازادی لەنیمە شەودا "تەرجەمەی پەروانە ستاری.

* شێوازی خەباتی ناتوندوتیژی پێویستی بە بیروبڕوا و باوەڕی ئایینی نییە(بەتەواوی بە هیچ باوەڕێکی ئایینی دیاریکراو) ئەگەرچی هێندێ جار بە مەبەستی ئایینی ئەنجام دراوە.

* میتۆدی خەباتی ناتوندوتیژی وەکو بنەما ئایینییەکان و چوارچێوە ئەخلاقییەکان، ئاشتیخواز نییە، بەڵکو لەباری پێکهاتەییەوە جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەواندا. لەو کۆمەڵگایانەدا کە سۆزی ئایینی، ئایدۆلۆژی و فکری بەسەر خەڵکدا زاڵە، خەڵك دەبێ بە روونی بزانن کە چ جیاوازییەك هەیە لەنێوان خۆبواردن لە توندوتیژی لەسەر بنەمای پێداویستییەکانی خەباتی جەماوەری لەپێناو دیموکراسی، لەگەڵ ئامۆژگارییە دینییەکان کە خەڵك بە خۆبواردن لە توندوتیژی هاندەدەن.

ئەگەرچی لە زۆر بابەتدا بەو شێوە قەبووڵ کراوە کە میتۆدە ناتوندوتیژییەکان تەنیا لە بەرانبەر ئەو حکومەتانەدا سەرکەوتوو دەبێ کە باوەڕیان بە قانون و لایەنگری بنەما مەدەنییەکانن، بەڵام مێژووی ئەم خەباتگەلە پیشانی داوە کە ئەم شێوازانە تەنانەت لە بەرانبەر رژێمە تاکڕەو و بێبەزەییەکانی وەکو نازییەکان وحکومەتە سەرەڕۆکانی کومۆنیزمیشدا سەرکەوتوو بووە.

زۆربەی کەسایەتییەکان وگرووپەکان باس لەوە دەکەن کە شێوازی ناتوندوتیژی تەنیا کاتێك سەرکەتوو دەبێ کە بتوانێ دڵی دەسەڵاتدارانی سەرەڕۆ بەدەست بێنێ و بە دروست کردنی خۆشەویستی، بگاتە سەرکەوتن. لەحاڵێکدا ئەم شێوازە لەکردەوەدا دەتوانێ زۆر توند و بەهێز دەربکەوێ و تەنانەت بەهێزترین دیکتاتۆرەکانیش بڕوخێنێ.

## پێشەکییە پێویستییەکانی سەرکەوتن:

خۆپاراستن لە بەکار هێنانی توندوتیژی و پەنابردنە بەر شێوازی ناتوندوتیژی، لەسەداسەد گەرەنتییەك نییە بۆ گەیشتن بە ئامانج، هەرواکە شێوازی توندوتیژانەش گەرەنتی سەرکەوتن ناکات.

هەرواکە بۆ میتۆدی توندوتیژانە پێش‌نیازگەلێك پێویستە، بۆ بەکار هێنان و بەدەست هێنانی ئاکام لە شێوازە بێتوندوتیژانەکانیش پێش‌نیاز پێویستە. بەتەنیا دووریی لە توندوتیژی و بەڕواڵەت پشت‌بەستن بە شێوازی ناتوندوتیژی و رازیبوون پێی تەنیا لە ئاستی قسە و دروشمدا، نابێتە هۆی سەرکەوتن و بەئامانج گەیشتن.

هێندێ لە شێوازە ناتوندوتیژییەکان لە کردەوەدا، بە ئاکام نەگەیشتوون و هێندێکیش بە سەرکەوتنێکی سنووردار گەیشتوون. هێندێ لە سەرکەوتنە بەدەست هاتووەکان کاتی و روالەتی ماونەتەوە، چونکە خەلك لەم هەلە بۆ پتەوکردن و بەفەرمی ناسینی ئاکامەکە هەولیان نەداوە، یان لە بەرانبەر ئەو هەرەشە و مەترسییانەدا کە دوای سەرکەوتن رووبەڕوویان بووەتەوە، بەباشی بەرگرییان نەکردووە و پارێزگارییان نەکردووە لەو ماف و ئازادییانەی کە بە هەولّ و ماندووبوونی خۆیان بەدەستیان هێناوە.(١)

لە هێندێ لە نموونەکانی ئەم خەباتانەدا، ئامانجە سەرەتاییەکان بە پشتبەستن بە بەرنامەی شۆڕشگێڕانەی رێکوپێك بەدی هاتوون، بەلاّم بۆ گەیشتن بە تێکڕای داخوازییەکان، شێوازە نوێیەکانی خەبات پێویست بووە.

لە هێندێ بابەتدا ئەم سەرکەوتنانەی کە بە شێوازی ناتوندوتیژی بەدەست هاتوون، هیچکاتێك بە شێوازی توندوتیژانە بەرهەم نەدەهاتن. بۆ تێگەیشتنی باشتری ئەم مەسەلە ناسینی ناوەڕۆکی ئەم خەباتانە پێویستە.

ئەو شێوازانەی کە خەباتی بێ توندوتیژی بە هۆی ئەوانەوە بە ئاکام دەگات، بە هەلومەرج و بارودۆخەکانەوە بەستراوەتەوە و لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی دی جیاوازی هەیە. باسکردنی ئەم خالّە زۆر گرینگە کە هێندێ لە خەباتە ناتوندوتیژییەکان، نەك بەناچار هەموویان، پێویستیان بە دوو پرۆسە و میتۆدی خەباتگێڕی زۆر تایبەتی و هەستیار هەیە. ئەم دوو شێوە بەم جۆرەیە:

١- هەبوونی توانای بەرەنگاریی و پووچەلکردنەوە یان پێچەوانە کردنەوەی سەرکوتگەرییەکان.

٢- توانای لەنێو بردن وهێدی هێدی لەنێوبردنی سەرچاوەکانی هێزی دوژمن.

لە درێژەدا پێداچوونەوەیەکی" کورت"مان لەسەر ئەم دوو بابەتە دەبێ.

## سەرکوتگەریی و سیاسەتی خەباتی جیو-جیتسۆ:

بەشێوەیەکی سروشتی، دیکتاتۆرەکان لە هەر کردەوە و ئایدیایەك کە دژ بەوان، یان مەترسییەك بۆ دەسەلاّتی ئەوان بێت، دەترسێن و لەبەرانبەریاندا دژەکردەوە نیشان دەدەن.

---

(١) بۆنموونە دەتوانین بە بزووتنەوەی خۆمالّیکردنی پیشەسازی نەوت هێما کەین کە بەهۆی کەم تەرخەمی خەلکو رێبەرانی بزووتنەوەکەوە ئاواتەکانی خەلك یەك شەوە لەدەست چوون.

دەسـەڵاتدارانی سـەرکوتگەر، دەست دەکەن بە ترساندن و ئازاردانی ئەو کەسانەی کە سەرپێچییان کردووە و لە مانگرتنەکاندا بەشدار بوونە، یان بە هەر شێوەیەك لە هاوکاری کردن خۆدەبوێرن. ئەم حکومەتانە زۆرجار لە سپاردن و دانی هێندێ ماف بە دژبەران و راکێشانی سەرنجی ئەوان لە پێناو کردەوەی باشتر و درێژەدان بە دەسەڵاتی خۆیان، خۆدەبوێرن و بە مل نەدان بە چاکسازی و ریفۆرم، بە شێوەی یەکلایەنە و تاك ڕەهەندی لە بەکارهێنانی توندوتیژی لەبەرانبەر دژبەرانی خۆیان کەڵك وەردەگرن.

کێشە و گرفتی دەسەڵاتداران لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو خەباتگێڕانەی کە بە شێوازی ناتوندوتیژی شەڕ دەکەن، لەبزۆزی و سرشتی ئەم جۆرە خەباتانە دایە" هەر بۆیە لە هێندێ بارودۆخدا، نەك لە هەموو بابەتێکدا، لەوانەیە دەسەڵاتدارانی سەرەڕۆ و سەرکوتگەر پرۆسەیەکی تایبەتی پێك بێنن کە "سیاسەتی جیو-جیتسۆ"ی پێدەڵێن.(١)

لەبنەڕەتدا ئەم سیاسەتە شۆڕشگێڕییە بۆ پێکدادانی سەربازی، لەلایەن ژاپۆن(یابان)ییەکانەوە گەڵاڵە کراوە. کارکردنی ئەم شێوازە لەسەر ئەم بنەمایەیە کە هێز و توانای دوژمن دژ بە خۆی بە کار دەبەن و بە کەڵك وەرگرتن لە هێزی دوژمن، ئەو فشارانە بە شێوەیەك دەخەنەوە سەر دوژمن. ئەگەرچی ئەم شێوازە، لەبنەڕەتدا بۆ خەباتی سەربازی گەڵاڵە کراوە بەڵام لەبواری سیاسیشدا بەکار دێت. حکومەتە سەرکوتگەرەکان لەم میتۆدە بۆ سەرکوتکردنی دژبەرانی خۆیان کەڵك وەردەگرن.

هێزە جەماوەرییەکانیش دەتوانن هەروەکو کاروبارە سیاسی و سەربازییەکان، واتای بنەڕەتی ئەم میتۆدە لە چوارچێوەی خەباتی ناتوندوتیژیدا بەکار بێنن. چونکە خەباتی سیاسی بە روانگەیەکی ناتوندوتیژی، دەتوانێ لە بەرانبەر سەرکوتگەرانی توندوتیژ و تەیار بە چەك و چۆڵ، بارودۆخێکی تایبەت و لێك دوور و ناتەبا پێك بێنی و وەکو شێوازی"جیو-جیتسۆ"، راتەکانێکی سیاسییان لێ بدات و لە کۆتاییدا هاوسەنگیی دوژمنان لە باری سیاسییەوە

---

(١) جیو-جیتسۆ یان جۆدۆ- ئەساسی وەرزشی جۆدۆ تێکدانی هاوسەنگی هاوکێش یان هاومالٚ بە کەڵکوەرگرتن لەکێشی ئەوە، ئەگەرچی کێشی زۆر بۆ هاوکێش پوانێك دێتە ئەژماردن بەڵام هەر بە کەڵکوەرگرتن لەم فاکتەرە، کێشی حەریف دژ بە خۆی بەکار دەبرێ. لەجۆدۆی سیاسیشدا دەتوانین توانای سەرکوتکەری حکوومەت دژ بە خۆی بەکار بێنین، بەم شێوە کە توندوتیژیو سەرکوتکارییەکانی رژیم لەسەر دژبەرانی بە شێوەی بەربڵاو بە ئاگاداری خەڵكو رێکخراوە نێونەتەوەییەکان بگەیەنینو بە وروژاندنی رقو قینی ئەوان لەدوژمن، ئابڕووو رەوایی ئەو تووشی قەیران بکەین.

بشێوێنێ. ئەم شێوازە، سەرکوتگەری و توندوتیژیی دەسەڵات دەگەڕێنێتەوە بۆ خۆیان و لەم ڕێگاوە هێزیان لاواز دەکات.

## جیو-جیتسۆی سیاسی:

پرۆسەیەکی تایبەت کە لەوانەیە لەماوەی خەباتی نا توندوتیژانەدا، بۆ گۆڕینی پێوەندیی دەسەڵات بەکار بهێنرێت. لە جیو-جیتسۆی سیاسیدا، خەڵك لە سەرکوتگەرییەکانی دەسەڵات لە خەباتی ناتوندوتیژیی جەماوەریدا، وەکو کاردانەوەیەکی نیگەتیڤ کەڵکی لێ وەردەگرن، تا ئەم سەرکوتگەرییە، بە فۆڕمی سیاسیی خۆی بگەڕێننەوە بۆ دەسەڵات و لەم ڕێگایەوە خەڵك لە بەرانبەر سەرکوتگەریی توندوتیژانەی دەسەڵات بە شێوەی خەباتی ناتوندوتیژیی خۆیان درێژە بدەن و پشوو درێژیی خۆیان لە دەست نەدەن و روو لە شێوازی توندوتیژانە نەکەن و درێژە بە خەبات بدەن. لە وەها دۆخێکدا سیاسەتی سەرکوتگەریی دەسەڵات، پێگەی دەسەڵات دەخاتە دژوارترین دۆخی رەخساوەوە.

ئەم سیاسەتە دەتوانێ شێوازی عەقیدە و روانگەی هێزەکانی سێهەم، گرووپە راوێژکارەکان و تەنانەت پشتیوانەکانی حکومەتیش(دووبەرەکی ناو دەسەڵات) بگۆڕێت. ئەم گۆڕینی روانگەیە لەوانەیە ببێتە هۆی رووخانی سەرچاوەکانی هێزی دەسەڵات و زۆرتر بوونی توانایی هێزی جەماوەر لە شێوازی جۆراوجۆردا بۆ مەحکوم کردنی دەسەڵات، درز خستنە ناو دەسەڵات و پەیوەست بوونی خەڵك بە ریزی خەباتکاران و لەکۆتاییدا ئەم ئاڵوگۆڕانە لە هێندێ بابەتدا دەتوانێ ئاڵوگۆڕێکی گەورە لە پێوەندییەکانی دەسەڵات و بە قازانجی خەڵك دروست بکا.

خەباتکاران لە درێژەی خەباتدا بە خۆبواردن لە توندوتیژی و درێژەدان بەم شێوازە، توانای خۆیان زۆرتر دەکەنەوە.

ئەم شێوازە دەبێتە هۆی زیادبوونی رق و قین لە دەسەڵاتداران لەسێ گرووپدا. ١- لەناو خودی دەسەڵاتدا ٢- کەسانێك لەناو کۆمەڵگا کە ئەم نارەزایەتییانە کاریگەریی لەسەریان بووە و ئامانجی خەبات بۆیان گرینگە. ٣- کەس و گرووپگەلێك کە بە شێوەی ناڕاستەوخۆ تێوەگلاون (وەکو ولاَتانی دیکە و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان). بێزارییەکی لەم چەشنە دەبێتە هۆی پەیدابوونی کەلێن لەناو دەسەڵاتدا. هەروەها دەبێتە هۆی زیاد بوونی هێزە تێکۆشەرەکان

و بەهێزبوونی پاڵنەری ئەوان و سەرەڕای ئەمانە هێزی سێهەمیش بە قازانجی هێزی خـەباتگێڕ و دژ بە دەسەڵاتداران دێنێتە گۆڕەپانەوە.

جیو-جیتسۆی سیاسی لە تێکڕای تێکهەڵچوونە ناتوندوتیژییەکاندا کارایی نییە. لـەکاتی نەبوونی جیو-جیتسۆی سیاسیدا، زۆرجار ئاڵ و گۆڕ لە پێوەندییەکانی دەسەڵاتدا دەگەڕێتـەوە بۆ رادەی هاوکاری کردنەکان.

## تێکشکاندنی هێز(دەسەلات)ی دوژمن :

سیاسـەتی جیـو-جیتسـۆ لـە هـەموو بارودۆخـەکان یـان لـە هێنـدێ لـە شـێوازە ناتوندوتیژییەکاندا کاریگەر نییە.

رێگایەکی دیکە کە دەتوانێ یارمەتیی بزووتنەوەکان بـدات تێکـدانی سەرچـاوەکانی ئـەو هێزەیە کە دەسەڵاتداران و دیکتاتۆرەکان پێیانەوە بەستراونەتەوە. ئەم شێوازە لە بنچینەدا لـە خەباتێکدا کارامەیی هەیە کە هەوڵی ئەوان بۆ گوشار خستنە سەر و ناچارکردنی دەسەلاتە بۆ ئەنجامـدانی کارێـك یـان پێشـگرتنیان لـە ئەنجامـدانی هێنـدێ چـالاکی دیکـە، یـان لـە هەلومەرجێکدا کە ئامانج لە خەبات، وردکردن و تێك شکاندنی رژێمە.

ئەم ستراتیژییە ساکارە، دیکتاتۆرەکـان بـۆ مانـەوەی خۆیـان پێویسـتیان بـە هاوکـاریی کەسانێکە کە حکومڕانییان بەسەردا دەکەن، بەبێ ئەم هاوکارییە ناتوانن سەرچاوەی دەسەڵاتی سیاسیی خۆیان بپارێزن. سەرچاوەکانی ئـەم دەسـەڵاتە سیاسـییە، ئەمانـەی لای خوارەوەیـە: (لەبەشی دووەم و سێهەمدا سەرچاوەکان وکۆڵەکە(بنچـینە) کـانی دەسـەلات بەتێروتەسـەلی شرۆڤە کراوە .)

- رەوایی و یاسایی بوونی حکومەت
- خەڵك، گرووپەکان وئەو رێکخراوانـەی کـە لـە قـانونی دانـراو و دەسـەڵات پێـڕەوی و هاوکارییان لەگەڵ دەکەن.
- زانست، پسپۆڕی و پێداویستییە زانستییەکان کە دەسەڵات پێویستی پێیانە و لەلایـەن خەڵکەوە دابین دەکرێ.
- هۆکارە نادیارەکان کە، بریتین لە هۆکارە دەروونی و ئامانج گەرایییەکان کە خەڵك ناچار دەکەن کە بە پشتگیری لە دەسەلات و پێڕەوی لە قانون بکەن.

• سەرچاوەی دارایی و کالاکان، کۆنترۆڵ و دەست پێڕاگەیشتن بە سامان و سەرمایەکان، سەرچاوە سروشتییەکان، سیستمە ئابوورییەکان، رێگاکانی پێوەندی و گواستنەوەی زانیارییەکان.

تەمبێ کردن و ئەو سزادانانەی کە بە سەر خەڵکدا دەسەپێندرێت، یان بەهۆیەوە هەڕەشە لە خەڵك دەکەن، یان گوشار دەخەنە سەریان بۆ ئەوەی رازی بن بە هاوکاری و گوێڕایەڵی رژیم بن و پشتیوانی لە سیاسەتەکانیان بکەن بە ئامانجی درێژەدان بە دەسەڵات.

ئەو هۆکارانەی لەسەرەوە باس کران، مانەوەی دەسەڵات مەیسەر دەکەن و رەوایی حکومەت بەوانەوە بەستراوەتەوە، بەڵام ئەم هۆکارانە خۆیان پێویستیان بە وەرگیران لەلایەن دەسەڵاتداران، هاوکاری خەڵك، رێکخراوەکان و دامەزراوە جۆراوجۆرەکان و هاوکاریی ئەوان هەیە.(١)

کە وا بوو، هێزی سیاسیی دەسەڵاتداران بۆ مانەوە و درێژەی ژیانی خۆیان پێویستیان بە دووبارە کردنەوە و بەهێزکردنی ئەم سەرچاوانە هەیە و ئەم سەرچاوانەش پێویستیان بە پشتیوانی خەڵك، لایەنگری و هاوکاریی ئەوان هەیە، کە ئەگەر ئەم هاوکارییانە بەردەوام نەبێت، هێزی سیاسیی دەسەڵاتداران لەنێو دەچێت. کە وا بوو هێزی سیاسی بە هەموو شکۆ و سامێکی رواڵەتییەوە کە هەیەتی لەرزۆك و لەناو چووەە، چونکوو بە خەڵکێکەوە بەستراوەتەوە کە دەسەڵاتداران حکومڕانییان دەکەن. هاوکاریی خەڵك و پێڕەوی کردنیان لە یاسا، گرەنتی کراو نییە(چونکوو لە حکومەتە سەرەڕۆکاندا بیانوی جەماوەر بۆ پشتیوانی لە قانون لاواز دەبێتەوە) و لەم رووەوە کە سەرچاوەی هێزی دەسەڵات خەڵکن، کە وا بوو ئەم هێزە سنووردارە، شیاوی برینداربوونە و لاواز دەبێت. خەباتی ناتوندوتیژی دەتوانێ بە پشتبەستن بە مانگرتن و بایکۆت هەریەك لە سەرچاوەکانی هێز بێت و خەڵکیش وەکو بنەما و بنچینەی ئەم سەرچاوانە دەتوانن لاواز و سنوورداریان بکەنەوە.

---

(١) وادیارە مەبەست لە"وەرگرتن لەلایەن دەسەڵاتداران"ەوە بەم مانایە کە خودی حکوومەت پێبەند بە کەمترین ڕادە بن.لەسیستمە حکوومیانەدا کە لەسەر بنەمای زەختو کوشتار بنیات نراون، سەرچاوەکانی هێزی ناوبراو، ئیتر مانایێکیان نامێنێ، بۆنموونە لەسیستمی حکوومەتی تالیباندا کە دابین کردنی لانیکەمی بارودۆخەکانی ژیانو خۆشگوزەرانی خەڵك مانایێکی نییە، جگە لەتەمبێکردنو سزادانو هۆکارە نادیارەکان، سەرچاوەکانی دیکەی دەسەڵات دەرناکەون.و

خۆبواردن لە هاوکاری و بەتەنگەوە نەبوونی گرووپە نارازییەکان، دەبێتە هۆی لەبەر یەك هەڵتەکان و ناکارامەبوونی سەرچاوەکانی دەسەلاّت. بۆ نموونە قبووڵ نەکردنی لێهاتوویی قانوندانەران لەلایەن گرووپە نارازییەکانەوە، مەشروعییەتی قانونی دەسەڵات دەخاتە ژێر پرسیارەوەو لەکۆتاییدا لەسەر گوێڕایەڵی گرووپە نارازییەکان، هێزەکانی ناو دەسەلاّت و تێکڕای خەڵك کاریگەری دادەنێ و دەتوانێ کێشە و گرفتێکی زۆر بۆ حکومەت پێك بێنێ.

مانگرتنی گشتی دەتوانێ چەرخەکانی ئابووری ولاّت لەکار بخات. خۆبواردن لە هاوکاریی ئیداری و رێکخراوەیی دەتوانێ لەباری "بورۆکراسی"یەوە چالاکییەکانی حکومەت ئیفلیج بکات و لە کۆتاییدا نافەرمانی و شۆڕشی (سەرکێشی)[1] پۆلیس و هێزە نیزامییەکان، توانای دەسەلاّت بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بزووتنەوە جەماوەرییەکان و درێژەدان بە دەسەلاّت تووشی قەیران دەکات.

لە نەبوونی ئەم سەرچاوانەدا، هێزی دەسەلاّت بەرەو لاوازی دەچێت و لە کۆتاییدا لەناو دەچێت. حکومەتەکان لە بۆشایی رەوایی سیاسیدا لەناو دەچن.

بە وتەی (دەبلیوو دووچ)[2] بە پێچەوانەی باوەڕی هەموو خەڵك، سەرەڕۆترین دەسەلاّتەکانیش بە هەموو هەیبەتی رواڵەتی خۆیانەوە، لە کردەوەدا بەستراونەتەوە بە پشتیوانی و هاوکاریی خەڵك و کۆمەڵگایەك کە حکومڕانیان بەسەردا دەکەن.

## چوار رێگا بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن:

ئەو بزووتنەوە ئاشتیخوازانە جەماوەرییانەی کە توانیویانە سەرکەوتن وەدەست بهێنن لەسەر چوار شێوازی بنەڕەتی دامەزراون(ئەم بابەتە لەبەشی چوارەمدا بە تێروتەسەلی باس کراوە .) ئەم چوار شێوە جیاوازە بەشێوەیەکی بەربلاّو بە١- تایبەتمەندییەکانی ئەو بارودۆخە قەیراناوییە کە ناکۆکییەکانی تێدا دروست بووە، ٢- ئەو بابەتانەی کە جێی ناکۆکین، ٣- تایبەتمەندییە کۆمەلاّیەتییەکانی خەڵك، ٤- تایبەتمەندی و چییەتییەکانی حکومەت، ٥- شێوازی ستراتیژیی خەبات، ٦- میکانیزمی گۆڕان و چاکسازی، ٧- شێوازی بەکارهێنراو بۆ

---

(١) بۆ ئاگاداری خوێنەران لەم کتێبەدا ئەم وشانە (نافەرمانی، شۆڕش، نارەزایەتی‌و...) بەمانای ناتوندوتیژی لەبەرچاو گیراون.

(2) w.duetsch

خــەبات، ٨- توانــایی، سیســتم خــوازیی و خــۆڕاگریی گرووپــە خــەباتگێڕەکانی خەڵکــەوە بەستراوەتەوە.

ئەو گوشار و تەنگە تاوکردنانەی کە لەلایەن خەڵکەوە بەکارهێنراون چوار جۆرە- دەروونی، کۆمەلأیەتی، ئابووری، سیاسی، کە هەرکامیان لە پانتاییــەکی بــەربلاُو لەتونـدی و سســتیدا بەکاردەبرێن. ســەرەڕای ئەمــە، لەوانەیــە بزووتنــەوە ناتوندوتیژییــە جەماوەرییــەکان لەســەر سەقامگیری و بەردەوامی سیستمی سیاسی و کۆمەلأیەتی کاریگەر بن و کردەوەیــان بگــۆڕن، یان پێش بە دەسەلأت بگرن لە بڕیاردانی دروست بۆ بەکار هێنانی سیاسەتێکی تایبەت.

لەقەیرانەکاندا خۆبواردن لە هاوکاری و هــەروەها خــەباتی خــەڵك لەوانەیــە لــە بــارابوون وتوانای دەسەلأتداران بۆ درێژەدان بە حکومەت کردن سست بکات و ببێتە هۆی لەناوچوونی.

لە بارودۆخی جۆراوجۆردا جیاوازیگەلێکی بنەڕەتی لــە شــێوازەکانی کــردەوەی بزووتنــەوە ناتوندوتیژییە جەماوەرییەکاندا هەیە. بۆ نموونە، چییەتی بزووتنەوە کرێکارییە خۆجییەکان بۆ زیادکردنی کرێ (موچە)، جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ بزووتنەوەی کەمایەتییەکان هەیە کــە بــۆ بەدەستهێنانی مافی تایبەتی یان هەندێ بزووتنەوە کە بۆ رووخانی حکومەتە سەرەڕۆکان هەوڵ دەدەن.

لە ئەگەری سەرکەوتنی ئەم خەباتانەدا، ئەو ئیمتیاز و چاکسازییانە کە بەدەســت هــاتوون ئاکامی یەکێك لەم چوار میکانیزمەیە.

بەمجۆرە نارەزایەتی دەربڕین بە یارمەتیی شێوازی ئاکاری بەدەگمەن دەبێتە هــۆی گــۆڕینی هەڵوێستی دەسەلأتداران بە شێوەی دڵخوازانە، چونکوو ئەوان ئەم کارە بە مانای پاشەکشە لە هەڵوێستەکانی خۆیان و جۆرێك رێفۆرم سەیر دەکەن، لە حاڵێکدا ئەنجامــدانی نارەزایــەتی بــە شێوەی گــەمارۆی چــالاکیی ئــابووری یــان خۆبــواردن لــە هاوکــاریی سیاســی، لــە زۆربــەی بابەتەکاندا، دەسەلأت ناچار بە قبووڵی هێندێ بابەت و دانی پوان بە نارازییەکان دەکات و لە راستیدا بەهۆی زۆر بۆ هێنان و گوشاری خەڵکەوە، ناچار بە رێکەوتن بوونە.

هێندێ لە نارەزایەتییــەکانی خــەڵك و خۆبــواردن لــە هاوکــاریکردنی ئــەوان زۆر بــەهێز، بەرنامەدارێژراو و ئامانجدار بووە و هێزی دەسەلأت بە خەباتی جەماوەری تا ئەو رادە دابەزیوە کە تەنیا لە رواڵەتدا، پلــەی سیاســیی خــۆی پاراســتووە و هــیچ چەشــنە هێــزی دزەکــردن و کارتێکەری نەبووە و لە ئەنجامدا ناچار بە بەجێهێشتنی دەســەلأت و لــە بەرانبــەر بزووتنــەوە

ناتوندوتیژییەکانی جەماوەردا بە چۆکدا هاتوون. لە راستیدا خەڵك بە بەکارهێنانی گوشار، دەسەلاٚتیان ناچار بە راپەڕاندن و قبووڵی هێندێ شەرت و مەرج کردووە.

لە هێندێ بابەتی دانسقەدا دوابەدوای کاریگەر نەبوونی شێوازەکانی چاکسازی، رێککەوتن و راوەستاندنی ناتوندوتیژی، نارەزایەتیی جەماوەری و ملنەدانی ئەوان بە دەسەلاٚت لە پانتاییەکی بەربلاٚوتردا ئۆرگانیزە کراوە و سەرچاوەکانی هێزی دەسەلاٚت و یەك دەستی و یەکگرتوویی ئەوان رووبەڕووی ناکۆکی و جیایی بووەتەوە و لە وەها دۆخێکدا رژیمەکان سەرەڕای لێکترازانی پێکهاتەیی، بە ئاسانی لێك هەڵوەشاونەتەوە و لەناو چوونە، کە بەم شێوازە دەڵێین هەرەس هێنان.

## کەڵك وەرگرتن لە شێوازی پێداچوونەوەکراو:

هەرچۆنێك بێت ئەم شێوازی خەباتی ناتوندوتیژییە رۆڵێکی زۆر گرینگ لە شیکردنەوە و لێکدانەوەی گرفتی توندوتیژی نواندن لە سیاسەت و کۆمەڵگادا دەگێڕێ، یان لە ئەگەری تێڕوانین لە پێکهاتەکانیدا، دەتوانێ هەی بێت. ئەم رۆڵە تا رادەیەکی زۆر بەو بابەتەوە گرێدراوە کە شێوازەکانی خەبات لە بارودۆخی قەیراناویدا تا چ رادەیەك لەکەم کردنەوەی سەرنج و روو تێکردن لە توندوتیژی لە کۆمەڵگادا کارتێکەرییان هەیە. بە وتەیەکی دی، ئەم شێوازە کاتێك سوودبەخشە کە کاریگەری لەسەر بیری توندوتیژی خوازیی گشت کۆمەڵگا هەبێ.

ئایا دەکرێ بنەمای ئەم جۆرە خەباتانە بە شێوازێك بنیاد بنرێن کە بە شێوەی سودمەند جێگرەوەیەکی کاریگەر و چارەسەرکەر بۆ توندوتیژیی بن؟ لە هێندێ بابەتدا تاکەکان بۆ ئەم پرسیارە وەلاٚمی پۆزەتیڤ دەدەنەوە، لە هەندێ بابەتی دیکەدا وەلاٚمی ئەم پرسیارە"رەنگە"، "دوور لە چاوەڕوانییە"، یان"نەخێر". وەلاٚمدانەوەی ئەم پرسیارە تا رادەیەکی زۆر بە تێگەیشتن وهەڵێنجانی تاکەکان بەم شێوە لە خەبات بەستراوەتەوە و هەروەها بەمە کە ئەم شێوازە وەکو جێگرەوەیەکی متمانە پێکراوی توندوتیژی، لە بارودۆخی قەیراناویدا تا چ رادەیەك دەتوانێ کاریگەری دابنێت.

دەکرێ بە پلەیەك لە تێگەیشتن و هۆشیاری بگەیت کە ئەم میتۆدە لە خەبات بە شێوەیەکی پراگماتیك و کارامە بە بەراورد لەگەڵ شێوازەکانی خۆڕسکدا[1] بگۆڕین کە لە کۆنەوە بۆ خەباتی ناتوندوتیژی کەڵکی لێ وەردەگیرا. ئەم کارە بە زیادکردنی هۆشیاری و زانستی ئێمە لە پێشنیازەکانی ئەم میتۆدە سەردەگرێ. هەرچی پانتایی زانستی ئێمە لەم بەستێنەدا بەربلاوتر و تێگەیشتنێکی باشترمان لێی هەبێت و بەرنامەڕێژی بۆ بەرنگاربوونەوە لەگەڵ قەیرانەکان و گەنگەشەکان کامڵ تر و بەربلاوتر بێت، بێگومان کارامەیی ئەم میتۆدەش زیاتر دەبێت.

بۆ گەیشتن بە ڕێگاچارەیەکی گونجاو و بەربلاو لەجێی بەکار هێنانی توندوتیژی و هەروەها بۆ هەڵسەنگاندنی گەشەی سیاسی میتۆدە ناتوندوتیژییەکانی داهاتوو، ناچارین کە بە لێهاتوویی و تەوژمی ئەم میتۆدە لەکاتی ئێستا و داهاتوودا سەرنجی زیاتر بدەین. خاڵی زۆر گرینگ ئەوەیە کە خەڵك و کاربەدەستانی حکومەت لە گەرمەی قەیرانەکاندا لەسەر ئەو بڕوایەن کە پەنابردنە بەر توندوتیژیی و بەکار هێنانی هێزی سەربازی، دڵخواز و کارامەیە. ئێستا پرسیار ئەمەیە کە، تا چ رادەیەك ئێمە دەتوانین تێگەیشتنێکی باشمان لەم شێوازە (خەباتی ناتوندوتیژی) هەبێت و تا چ ئاستێك دەبێ پێداچوونەوە و چاکسازی تێدا بکەین؟ هەروەها ئەم میتۆدە تا چ رادەیەك دەتوانێ جێگرەوەیەکی کارامە بۆ بەکار هێنانی توندوتیژی بێت؟

گەشەی سیاسیی شێوازەکانی خەباتی ناتوندوتیژی و خستنەڕووی جێگرەوەگەلێکی باش و دوور لە توندوتیژی، لە جێی بەکارهێنانی توندوتیژی، بۆ چوارچێوەیەکی بەربلاو لە قەیرانەکان بەتایبەتی ئەم بابەتانەی خوارەوە پێویستن:

* لەسەرکار لابردنی دیکتاتۆرەکان.

* پووچەڵکردنەوەی کوودەتاکان و پێشگیری لە هاتنە ئارای دیکتاتۆرە نوێکان.

* بەرگری لە بەرانبەر دەستدرێژی و داگیرکاری دەرەکی.

* پاراستن و پارێزگاری لە فەرهەنگ و شێوازی ژیانی خەڵکی خۆجێیی(وەکو کەمایەتییە ئایینی و نەژادییەکان).

---

(١) مەبەست لەخۆڕسك ئەمەیە کە ئەگەر لەکۆنەوە شێوازی خەباتی ناتوندوتیژی بووبێت لەسەر بنەمای چوارچێوەیەکی کۆنووسکراوو تیۆریك نەبووە، لەم کتێبەدا هەوڵ دەدەین تا بۆ ئەم شێوە خەباتانە شێوازێکی کردەکی ببینینەوە.

* پێشگیری لە بڵاوبوونەوەی نابەرانبەریی کۆمەڵایەتی و ئابووری.
* پاراستن و بڵاوکردنەوەی تێکۆشانە دیموکراتیکەکان و بەرگری لە مافی مرۆڤ.
* یەکدەست کردنەوە و لێکدانی شێوازەکانی دیکەی ناتوندوتیژی لەگەڵ پێکهاتەکانی کۆمەڵگایەکی دیموکراتیکدا.

## کەمکردنەوەی خواستی شەڕ و شێوازەکانی دیکەی توندوتیژی:

لەپێناو دەستەبەرکردنی ئەم جۆرە ئامانجانە و ئامانجی هاوچەشنی قەیرانگەلی تایبەت کە لە دێڕەکانی پێشتردا باسکران و لەبەر ئەوەی شێوازە ناتوندوتیژییەکان بە شێوازی کاریگەر و کارامە کار بکەن، پێویستی بە پلانێکی ستراتیژیی هەیە. بە راپەڕاندنی قۆناغ بە قۆناغی بەرنامەی ستراتیژی، دەرەتانی جێگیرکردنی یەك بە یەکی ئەم شێوازە پاڵاوتەکراو و کارامانە لەسەر بنەمای شێوازی ناتوندوتیژی لە جێگەی شێوازی توندوتیژانە هەیە. بۆ وەدەست هێنانی ئەم مەسەلە گرینگە و بۆ گەشەپێدان و پەرەپێدانی تواناییەکانی شێوازە نا توندوتیژانەکان، بۆ بەڕێوەبردنی دژایەتییە قەیراناوییەکان، بە رادەیەکی زۆر، پێویست بە لێکۆڵینەوە، شیکردنەوە، توێژینەوەی ستراتیژیی، گەشەی سیاسی، بەرنامەڕێژی و هەنگاونانی نەترسانە هەیە" کە هەموو ئەم بابەتانە لە بەشە جۆراوجۆرەکانی ئەم کتێبەدا تاوتوێ دەکرێت.

لەم رەوتەدا پێویستمان بە رێنوێنی و کەڵك وەرگرتن لە ئاگایی و زانستی مێژووناسان، دەروونناسانی کۆمەڵایەتی، کۆمەڵناسان، تیۆری داڕێژەرانی سیاسی و بەرنامە داڕێژەرانی ستراتیژی هەیە. ئەمە بەس نییە کە تەنیا خۆ بە خوێندنەوەی میتۆدەکانی ناتوندوتیژییەوە خەریك کەین، بەڵکو لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی بابەتەکانی دیکەی وەکو رادەی بێتوانایی و لاوازیی دیکتاتۆرەکان وحکومەتە ستەمکارەکانیش پێویستە. خاڵێکی دیکە کە زۆر گرنگە، فێربوونی چۆنیەتی بڵاوکردنەوە و گەشەی توانایی رامانی ستراتیژی و بەرنامەڕێژی ستراتیژی بۆ خەباتی ناتوندوتیژی داهاتووە. بۆ پراکتیزەکردنی ئەم هەوڵانە و وەدیهاتنی ئەم بابەتانە پێویستمان بەوەیە کە چاوێك بە هۆکارە میتافیزیکی و دژی خواستە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و مۆدێرن، دەسەڵاتە نەتەوەیی و هێزە نێونەتەوەییەکاندا بخشێنین. ناوەندگەرایی دەسەڵات، میلیتاریزمی سیاسی، زاڵیی میتۆدە نەریتخوازانەکانی چارەسەری کێشەکان و هێندێ هۆکاری دی بوونەتە رێگرێکی گەورە لە بەرانبەر بەڵگە پەسندکراوەکان و

توانایی ئەنجامدان و شوێن دانەریی شێوازە ناتوندوتیژییەکان. هەندێ بوار هەیە ئەوە روون دەکەنەوە کە سۆزی کۆتایی کۆمەڵگا بۆ توندوتیژی یان خۆبواردن لێی و پەنابردنە بەر شێوازی بێتوندوتیژانە، دەرەنجامێکی زۆری لەسەر پێکهاتەی سیاسی و کۆمەلایەتی ئەو کۆمەڵگایە هەیە.

به راشکاوی ئەم خاڵە روون بۆتەوە کە بزووتنەوە توندوتیژی خوازانەکان زۆرتر دەبنە هۆی هاتنە سەرکاری رژیمە ناوەندگەرا و سەرکوتگەرەکان. لە حاڵێکدا زۆرجار خەباتی مەدەنی و ناتوندوتیژی دەبنە هۆی هاتنەسەرکاری دەسەلاتێکی جەماوەرییانە بە ئازادییکارکردنی زیاترەوە. دەکرێ هێزی نیزامی بۆ سەرکوت و گوشار خستنەسەر خەڵك بەکار بێت، لە حاڵێکدا خەباتی ناتوندوتیژی کەرستەیەکە بۆ خەڵك تا بەو شێوە بۆ دەست گەیشتن بە سەربەستی و بەرگری لە ئازادی کەڵکی لێ وەرگرن و پێش بە هاتنە سەرکاری حکومەتێکی سەرکوتگەر بگرن. هۆشیاریی ورد لە توانستی پێوەندی کردن و جێبەجێکردن و پێکەوەژیانی هێز و میتۆدەکانی بەکارهێنانی فشاری ناتوندوتیژی، دەتوانێ روونکەرەوەی شێوازگەلی کردەیی و کاریگەر بێ کە بەرلەمە بە دروستی تاوتوێ و شی نەکراوەتەوە. ئەم مەیلە ئەو تواناییەی هەیە بە فۆرمێکی باش و لە رێگای کەمکردنەوەی توندوتیژی، ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتی لە سیاسەتە مۆدێرنەکان و پێوەندییە نێونەتەوەییەکاندا پێك بێنێ.

سەبارەت بەوەی کە ئێمە تا چ رادەیەك دەتوانین بۆ جێگۆڕکێی شێوازی ناتوندوتیژی لەگەڵ شێوازی توندوتیژانە سەرکەوین و شایەدحاڵی کەمبوونەوەی پشتبەستن بە شێوازی نیزامی و شێوازەکانی دیکەی گرێدراو بەوەوە بین، پەیوەستە بە چۆنیەتی و ئاستی کاریگەربوونی ئەو جێگرەوەیە کە ئێمە لەجێگەی شێوازی توندوتیژانە هەڵی دەبژێرین.

پرسیاری حاشا هەڵنەگر ئەوەیە کە ئایا ئێستا ئێمە بۆ رێفۆرمی ئەم شێوازە و بەکارهێنانی لە قەیرانەکان و خەباتەکاندا هەوڵ دەدەین و زمانی توندوتیژی و تۆقاندن بە بەکارهێنانی شێوازی ناتوندوتیژی و سوود وەرگرتن لە خاڵە بەهێز و کاریگەرەکان جێگیر دەکەین؟ ئێمە لەم کتێبەدا هەوڵ دەدەین بۆ تەواوی ئەم پرسیارانە چوارچێوەیەك بخەینەروو و رێبازێکی کارایان بۆ بنووسین.

## تیۆری دەسەڵاتی سیاسی:

وا پێ دەچێت کە هەوڵ بۆ بەدەستهێنانی دەسەلاّت(هێز)، خواستی سروشتی مرۆڤەکان، گرووپە مرۆییەکان وکۆمەڵگاکانە. پێویستیی بەدەسهێنانی هێز لەنێو نەتەوەکان، حکومەتەکان، کۆمپانیاکان و تەنانەت لەنێوان هاوڕێکانیشدا، دەبێتە جۆرێك لە کێبڕکێ.[1] ڕەنگە بۆ زۆربەی هاوولاّتیان ئاشناترین شێوازی هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی هێز، ئەو ناڕەزایەتییە سیاسییانەیە کە وەك کاردانەوەیەك بۆ چۆنیەتی دابینکردنی داهات، باجەکان و بەرنامەی ئابووری حکومەتەکان دەردەکەوێ. پارێزەرانی دادگاکان، راوێژکارانی حقووقی، ئەندام پەڕلەمانەکان و بەرپرسانی پسپۆڕ و لێهاتوو لەبواری پێوەندییە گشتییەکان، هەموویان هەوڵ دەدەن کە بەرگری بکەن لە مافی بریگرتەکان(موکل)ی خۆیان لە باج دانەکان و باجە سەپێنراو و بێ بەرانبەرە حکوومییەکان بە بەستنی گرێبەستی بەسوود. لە هێندێ بابەتدا شێوەی بەکارهێنانی ئەو باجەی لە خەڵك وەردەگیرێ پرسیارخوڵقێنە و بەرپرسانی حکوومی شێوەیەکی روون لە بەکارهێنانی ئەم باجانە بە خەڵکی نادەن. بۆ نموونە چاوخشاندنێکی ڕێژەیی بەسەر بوودجەی ڕێکخراوی بەرگری ئەمریکا پیشاندەری بابەتگەلێکی زۆرە کە بەرپرسانی حکوومی دەستیان داوەتە تەیارکردنی سوپای ئەو وڵاتەوە بە پاپۆڕ، فڕۆکە و چەك و چۆڵێکەوە کە هیچ پێویستیان بەوانە نییە، بەتایبەتی کە هێندێ لەو کەرستانە کە کڕیویانە، بریتین لە کەرەستەی چەکداری تەواوکۆنە، بە داڕشتنێکی لاواز یان کەرەستەی ناپێویست. ئەو بوارانەی کە بەرپرسانی حکوومی دەیانەوێ سەرمایەگوزاری تێدا بکەن، دەتوانێ بەشێوەی نهێنی بێت و زانیارییەکانی بەتایبەتی بۆ زۆربەی خەڵك کە زانیارییەکی کەمیان لەسەر مەسەلە ستراتیژیکە نێودەوڵەتی و ئەمنییەکان هەیە بلاّو نەبێتەوە.

تەنانەت زۆرێك لەو بوارانەی کە باجەکانی تێدا سەرف دەکرێن، لەوانەیە بەهۆی ئەم بێ ئاگاییەوە، لەلایەن خەڵکەکەوە قبووڵ نەکرێ. لەهەرحاڵدا، چۆنیەتی بەکارهێنانی باجە کۆکراوەکان لەو بابەتە سیاسییە باس وروژێنانەیە لە دیموکراسییەکاندا و کاردانەوەی هەوڵە بەردەوامەکانە بۆ کۆنترۆڵ و کارتێکەری لەسەر هێزی دەسەلاّتداران.

---

(١) جیاوازی نێوان هێزی سیاسیو کۆمەڵایەتی لەمەدایە کە هێزی کۆمەڵایەتی بە مانای بە کۆنترۆڵ دەرهێنانی کرداری ئەوانیدی- تاك یان گرووپە ئینسانییەکان- بە شێوەی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆیە، لەحاڵێکدا هێزی سیاسی بە مانای بەکارهێنانی هێزی کۆمەڵایەتی لەپێناو ئامانجە سیاسییەکاندایە.

قەیراناویترین و دژوارترین شێوەی رووبەڕووبوونەوە لەنێوان خەڵك و حکومەتدا لە وڵاتانی ئەفریقایی، ئاسیایی و جیهانی سێهەمدا کاتێك روودەدا کەخەڵك بۆ وەرگرتنەوەی مافە پێشێلکراوەکانی خۆیان دەست دەدەنە خەبات و بەربەرەکانێ بۆ بەدەستەوە گرتنی هێزێك کە لە چنگ دەسەڵاتدایە تا بەجەماوەری کردنەوەی هێز، بۆ چاکسازیی بەرنامەکانی خۆیان بەکاری بێنن، کە ئەمە زۆر بەربڵاوتر لە کێشەی نێوان خەڵك و کاربەدەستانی رژێم لەسەر مەسەلەی داهاتی "باج"ەکانە کە زۆرتر لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا روو دەدا. بە جەماوەری کردنەوەی هێز، هەنگاوی یەکەمە لە رێگای دیموکراسیدا، چونکوو حکومەتی دیموکراتیك، حکومەتی کۆمەڵایەتی کردنی دەسەڵات(هێز)ی سیاسییە.

کاتێك ئامێری لەرزۆکی بڕاردە، لەنێوان ئازادی و سەرەڕۆییدا، سەرەنجام لە دووایین هەڵبەز و دابەزدا، لەسەر بەربژاری سەرەڕۆیی دەوەستێ، بۆ خەڵکی ستەملێکراو تەنیا هیوا، رزگاری لە بارودۆخی هەنووکەییە، بەڵام چۆنیەتی گۆڕینی بارودۆخی هەنووکەیی و رێگای رزگاریی لێی بەستراوەتەوە بە وشیاری خەڵك لەجەوهەری دەسەڵات و سەرچاوەکانی داینکردنی دەسەڵات. بەهۆی پێویستیی ناسینی دەسەڵات و سەرچاوەکانی، لە درێژەی باسەکەدا سەرەتا پێناسەی دەسەڵاتی سیاسی و بەدوای ئەودا تیۆرییەکانی دەسەڵاتتان پیشان دەدەین.

**دەسەڵاتی سیاسی-** بە کۆمەڵە توانایی و تەوژمێك دەڵێن کە بۆ دیاریکردن و بەکارهێنانی سیاسەتە فەرمییەکانی کۆمەڵگا بەکار دێت. دەسەڵاتی سیاسی لەوانەیە لەلایەن رێکخراوەکانی گرێدراو بە دەسەڵاتەوە بەکاربێت یان لەوانەیە بەپێچەوانەوە، لەلایەن گرووپ و رێکخراوەکانی دژبەری دەسەڵاتەوە بەکاربێت.

لەوانەیە هێزی سیاسی راستەوخۆ لە رووبەڕووبوونەوەکانی نێوان خەڵك و دەسەڵاتدا بەکار بێت، یان وەکو پاشەکەوتێك بۆ بارودۆخە قەیراناوییەکانی داهاتوو هەڵدەگیرێت.

## تیۆری هێزی یەك پارچە یان پاوانخواز:

ئەم مودێلە، هێزی دەسەڵات بە شێوەی هەرەمی پیشان دەدا کە هێزی فەرمانڕەواکان لە لوتکەی هەرەمەکەدایە و بەهیچ شێوەو جۆرێك گۆڕانی بەسەردا نایەت. لەم هەرەمەدا خاوەنانی هێز لەوانەیە بگۆڕدرێن، بەڵام پێکهاتەی دەسەڵات ئەوەندە پتەوە کە هەرگیز ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایەت و بێ لە بەرچاو گرتنی پێکهاتەی دەسەڵات و سەرچاوە جۆراوجۆرەکانی، هیچ چەشنە مەیلێك بۆ ئاڵوگۆڕی پێکهاتەیی قبووڵ ناکات. ئەم تیۆرییە

لەســەر ئــەم بنەمایەیــە کــە خــەڵك بــە پشــتیوانی و بڕیارەکــانی خــاوەن دەســەڵاتەکانەوە بەستراونەتەوە و ئەوانن کە چاکە و خراپەی خەڵك و چۆنیەتی بەکارهێنانی هێز لە کۆمەڵگادا دیاری دەکەن. بەشێوەیەکی باش خــاوەن هێــز لــەم پێکهاتەیــەدا لــە ڕێگــای هەڵبــژاردنێکی ڕێکوپێــك و قانونییــەوە لەســەر کــار لادەبــرێ، بــەڵام توخمــە ســەرەکییەکان و پڕۆســەکەی نەگۆڕن(تەنیا شکڵ و شێواز دەگۆڕدرێن).

لەسەر بنەمای ئەم حەقیقەتەیە کە لە زۆربەی ڕژێمە ستەمکارەکاندا هەڵبــژاردن بــەڕێوە دەچێ، بەڵام ئاکامەکەی لە پێشدا دیاری دەکرێ و هەموو شێوازی هەڵبژاردنەکە لــە کــۆنترۆڵ دایــە" وەکــو حکومــەتی ژنــەڕاڵ(نــوین) لــە"بۆرمــا"و ڕابێــرت موگــابی لــە"زیمبــابۆ" کــە ساختەکارییان لە هەڵبژاردنەکاندا،[1] بە بەشێك لە جەستەی ئەو هەڵبژاردنانە دەزانی.[2]

ئەوپەڕی هیوای حکومەتە سەرەڕۆکان ئەوەیە کە خەڵك(تەنانەت بە زۆر) لەگــەڵ چــییەتی پێکهاتەی ئەم دەسەڵاتەدا بێنەوە و قبووڵی بکەن. حەقیقەتی روون ئەوەیە کە دەســەڵاتدارانی پاوانخواز بۆیە هێز و دەسەڵات بە توندوتۆڵی لــە چــنگی خۆیــان رادەگــرن، کــە بتــوانن بــەو کەرستەیە خەڵکەکە بە پێچەوانەی ویستی دەروونی خۆیان، ناچار بە قبووڵی حکومەت بکــەن و بەجۆرە دەسەڵاتی خۆیان بەســەریاندا بســەپێنن. گوشــار و کەڵــەگایی کــردن لــەم مــودێلی هێزەدا، وەکو یەکەمین و یاسایترین کەرستەیە بۆ سەپاندنی ژێردەستیی.[1] ســەدەی بیســتەم پڕە لەم نموونانە، لە دەیەکانی ١٩٣٠و١٩٤٠ی ز. جۆزێف ستالین، ڕێبەری یەکێتیی سۆڤیەت

---

(١) بەپێی مانای دیمۆکراسی، ئەڵێن مەرج بۆ بوونی حکوومەتێکی خەڵك سالار، هەڵبژاردنێکی ئــازادو دوور لە درۆو تەزویرە. هەر بەم هۆیەوە دەســەڵاتدارانی ســەرەڕۆ بــۆ هێشــتنەوەی ئــابڕووی خۆیــان، بەســەرکەوتن لەهەڵبژاردنەکانو ژمارەی دەنگەکان گرینگی زۆر دەدەن.و

(٢) بێ‌گومان حکوومەتە دیکتاتۆرەکان لەحەساوکردنەکانیان لەهەڵبژاردنەکانــدا بــە قــازانجی خۆیــان هەڵــە دەکەن. وەکوو حکوومەتی سەربازی برمە کە لەگەڵ بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنەکانی ســاڵی١٩٩٠دا رازی بــوو، بەڵام لەئەوپەڕی ناباوەڕیدا کێبەرکێکەی دۆڕاند. دژکــردەوەی حکوومــەتی ســەربازی خۆبــواردن لــە ئــیرادەی خەڵکو ئاکامی هەڵبژاردنەکان بوو کە سەرنجام بە هەڵوەشانەوەی هەڵبژاردنەکە، دەستی دایە گرتنی ڕێبــەرانی گرووپە سیاسییەکان_ن

(١) حەســەن قــازی مــورادی لــەکتێبی "اســتبداد در ایران"یــانی ســەرەڕۆیی لەئێرانــدا، جیــاوازی هێــزو دەسەڵاتدارێتی بە باشی لێك‌دەداتەوەو پیشان دەدا کە دەسەڵاتدارێتی حکوومەتەکان لەسەر بنەمای پشتیوانی جەماوەرەوەیەو زۆرو زەختی حکوومەتەکان بەهۆی پشتیوانی نەکردنی جەماوەرەوە زۆر سستو لاوازە.و

نزيك بە بيست مليۆن كەسی كە پێدەچوو لە دژبەرانی راستەقینە و پەنگراوی دەسەڵاتی ئەو بن كوشت. جەماوەرێكی زۆر لە خەڵكی سۆڤییەت لەكاتی شەڕی دووەمی جیهانی لە گۆڕەپانی شەڕ لەگەڵ ئاڵمانیادا كوژران. ئەم نموونانە ئەوەمان بۆ روون دەكاتەوە كە قۆرغ بوونی هێز لە دەست گرووپێكی تایبەتیدا و نەبوونی دەرەتانی رەخنە و پرسیار لە حكومەت چ كارەساتێكی مرۆیی بەدواوە دەبێت.

بۆ كۆتایی هێنان بە حكومەتە سەرەڕۆكان لە چوارچێوەی خەباتی ناتوندوتیژیدا، دەبێ خەڵك بە روونی مانای هەرەمی یەكدەستی دەسەڵات بزانن و پاشان بە پێكهاتەیەكی سەرتر لەو، لەباتی ئەوەی دەسەڵات بە شێوەی پاوانكراو لە دەست حكومەتدا بێت، بیر لە دابەشكردنی دەسەڵات بە شێوەی یەكسان بكەنەوە.

ئەم مودێلە سەرەڕای ئەوەی كە خەڵك بە بیركردنەوە لەسەر ئەم بابەتە هانددەدا كە چۆن دەسەڵاتدارانی سەرەڕۆ هێزیان لە باوەش گرتووە و بە تەنیا پاوانیان كردووە، هەروەها ڕێنیشاندەرێكیشە بۆ بیركردنەوە لەم بابەتە كە، چاكسازیی سیاسی یان گۆڕینی دەسەڵاتدارانی سەرەڕۆ لەگەڵ چ تەنگ و چەڵەمەیەكی تاقەت پڕوكێندا رووبەڕووە، بەم مانا كە لەلایەكەوە ئەم دەسەڵاتدارانە بەهۆی قۆرغكردنی هێز یان دەسەڵات زۆر بەهێز و بەتوانا دەبنەوە و لە لایەكی تریشەوە، ڕێكخراوە مەدەنی و هێزە كۆمەڵایەتییەكان بەهۆی بەشداری نەكردنی سیاسی و كۆمەڵایەتییەوە، گیرۆدەی بێتوانایی و ناكارامەیی دەبنەوە و بەوجۆرەی كە دەبێ، ناتوانن گوشار بخەنە سەر دەسەڵات. لە مودێلی هەرەمی دەسەڵاتدا بەهۆی كۆبوونەوەی هێز لە دەست حكومەتدا، چاكسازیی پێویستی بە شرۆڤەیەكی بەربلاو لە مودێلی هێز و ناسینیی هەیە و بەبێ ئەم ناسینە، خەبات زۆر ئەستەم دەبێت، كە ئەمە خۆی خاڵێكی گرنگ دەبێت بۆ ئەو كەسانەی كە خەون بە چاكسازییەوە دەبینن، تا بە سەرنجدان بەم مودیلە، خەونەكانی خۆیان بە كێشانی پلانێك لە جۆرێكی دیكە لەدەسەڵات بهێننە دی، كە هەر هەمان مودێلی "پلۆرالیزم"ە و بەپێچەوانەی جۆری قۆرغ كراو و ناوەندگەرا، دەسەڵات لە پانتایی كۆمەڵگادا دابەش دەكا.

**مودێلی دەسەڵاتی پاوانکراو**

| |
|---|
| **دەسەڵات (فەرمانڕەوایی)**<br>ڕەخنە هەڵنەگر<br>گۆڕان و چاکسازی هەڵنەگر |
| **خەڵك**<br>سەر بە دەسەڵات<br>ناچار بە ملکەچی ڕەها<br>نەبوونی دەسەڵاتی ڕەخنەگرتن |

## مودێلی(جۆری) دابەشکردنی دەسەڵاتی پلۆرالیزم:

مودێلێکی دیکە کە یارمەتییەکی زۆر بەناسینی جەوهەری دەسەڵات دەدات، مودێلی دابەشکردنی دەسەڵاتی پلۆرالیزمە. بە پێچەوانەی مودێلی پاوانخوازەوە کە دەسەڵات بە پێکهاتەیەکی یەکگرتوو و چڕبۆوە لە لوتکەی پلەی دەسەڵاتدایە و بەهێچ شێوەیەك ناگۆڕدرێت، ئەم شێوازە، دەسەڵات لە پانتایی کۆمەڵگادا دابەش دەکات و بە بڵاوکردنەوەی لەنێوان ڕێکخراوە جۆراوجۆرە مەدەنی و حکومییەکاندا، پێشگیری دەکا لە دروست بوونی دەسەڵاتێکی سەرەڕۆ و ڕەخنە هەڵنەگر. لەم مودێلەدا، دەسەڵات زۆرینەخواز و لەرزۆکە. [1]

لەم مودێلەدا، دەسەڵات لە چینە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگادا دابەش دەکرێت و دەسەڵاتداران تەنیا لە بابەتگەلێکدا دەتوانن دەسەڵاتی خۆیان بەکار بێنن کە خەڵك ئیزنیان پێ دەدەن، بە واتایەکی دی، دەسەڵاتداران تەنیا لەسەر ئیزنی خەڵك و هاوکاری ئەوانە کە دەتوانن بە سەر کۆمەڵگادا حوکم بکەن. ئەم هاوکاری کردنە دەتوانێ بەپێی خواست یان بە زۆر یان ئاکامی کەمتەرخەمی و سەرنج نەدانی خەڵك یان تەنانەت بەهۆی کارتێکەری فەرهەنگی گوێڕایەڵییەوە بێت، بەڵام هەرچۆنێك بێت، خاڵی سەرنجراکێش ئەوەیە کە بە هۆی دابەشبوونی دەسەڵات لە نێوان خەڵك و کۆمەڵگادا، ئەگەر بێت و خەڵك لە کردەوەی دەسەڵاتداران ڕازی نەبن، دەتوان لە هاوکاری کردنی خۆببوێرن و لە دابین کردنی سەرچاوەکانی هێزی دەسەڵات پارێز کەن. چونکوو لەم

(١) ئەم مودێلە لەراستیدا بەهۆی خەڵکی بوونییەوە لەئاستی نێونەتەوەییدا باڵادەستی هەیە بەڵام لەبەرامبەر خەڵکیدا لەرزۆکە.م

مودێلەدا، دەسەڵات وەکو ئەمانەتێك وایە کە خەڵك دەیدەنە دەست بەرپرسانیحکومەتەوە و لە ئەگەری نەشیاو بوونیدا، وەری دەگرنەوە.

ئەم مودێلی دەسەڵاتە بەبەراورد لەگەڵ مودێلی پاوانخوازدا لە دەسەلاتدارێتییەکی زۆرتر بەهرەمەندە، چونکوو بناغەکانی ئەم دەسەڵاتە خەڵکن.

**سەرچاوەکانی دەسەلاٌت_** بەگشتی دەتوانین شەش سەرچاوەی گشتی بۆ دابینکردنی هێزی حکومەت ناو ببەین، کە لە راستیدا بنەمای هێزی سیاسیی دەسەڵاتن، وەکو رەوایی(مشروعیت) (کە لە مافی دەنگدانی خەڵکەوە سەرچاوە دەگرێ)، سەرچاوە مرۆییەکان، زانست و شارەزایی، هۆکارە نادیارەکان، سەرچاوە داراییەکان و قەدەغەکردنەکان.

ئاخێزگەی تێکرای سەرچاوەکانی هێز، خەڵکن. هەریەك لەم سەرچاوانە بە وەرگرتن، هاوکاری و پێڕەوی کردنی خەڵك و رێکخراوەکانی خەڵکییەوە بەستراوەیی زۆریان هەیە و دەسەڵاتی سیاسیی حکومەتیش پەیوەندیی بە رادە و هێزی ئەم سەرچاوانەوە هەیە کە لەلایەن خەڵکەوە دابین دەکرێ. کاتێك کە دابین کردنی ئەم سەرچاوانە لەلایەن خەڵکەوە کەم بێتەوە یان ببڕدرێ، حکومەت تووشی شپرزەیی یان رووخان دەبێ.

لە درێژەدا، سەرچاوەکانی هێز بەشێوەی روون لێکدراوەتەوە و چۆنیەتی کاریگەرییان لەسەر دەسەڵات و پووچەڵکردنەوەی، باس کراوە. سەرچاوەکانی هێز(دەسەڵات) لەناو دامەزراوە و رێکخراوە جەماوەرییەکاندا کە پێیان دەڵێین"پاڵپشتی دەسەڵات" دەردەکەون، پاڵپشتی دەسەڵات لەبەشی سێهەمدا شرۆڤە دەکرێ.

## ١- رەوایی:

رەوایی بنەمای سەرەکیی بانگەشەی بوونی مافی دەسەلاتدارێتی و داخوازی لە خەڵکە بۆ گوێڕایەڵ بوون. زۆرجار ئاکامی هەڵبژاردنەکان وەکو تۆکمەترین بەڵگە بۆ سەلماندنی لێهاتوویی بۆ حکومەت کردن لەبەر چاو دەگیرێ. هەر بەم بۆنەیەوەیە کە حکومەتە سەرەڕۆکان، چاودێرییەکی زۆری هەڵبژاردنەکان دەکەن و هەڵبژاردنێکی پاوانکراو، لەرێگای سندوقە شاراوەکانیانەوە بەرێوە دەبەن و بە شێوازی جۆراوجۆر زەندەقی دەنگدەران دەبەن، چالاکییەکانی هەڵبژاردن بۆ دژبەرانی خۆیان سنووردار دەکەنەوە و لە راگەیاندنی ئاکامی ئەو هەڵبژاردنانە کە بە زیانیان شکاوەتەوە خۆدەپارێزن. یاسایی بوون بۆ هەر حکومەتێك حەقیقەتێکی زۆر گرینگە، ئەم مەسەلە کە

حکومەتێك لەسەر بنەمای یاسای بنەڕەتی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرتووە یان ئەوەیکە نایاساییە، دەرەنجامگەلێکی زۆر جدی لە ئاستی ناوخۆیی و نێونەتەوەییدا بۆ دەسەڵاتداران بەدواوە دەبێ.

لە ئاستی ناوخۆییدا لە دەستدانی ئابڕووی قانونیی رواڵەتی، پوان(امتیاز)ێکی گرینگ بۆ رەوایی پێدان بە گرووپە سیاسییە دژبەرەکان لە قەڵەم دەدرێ. گرووپە سیاسییەکانی دژبەری حکومەت، بە پشتبەستن بە چەمکی وشەی"بەڵێنی خەڵکی" ئەم خاڵە وەبیر خەڵك دێننەوە کە رژێمی نایاسایی ئەم پرەنسیپە بنەڕەتییە پێشێل دەکا و ئیتر هیچ هۆیەك بۆ درێژەپێدانی هاوکاری خەڵك لەگەڵ رژێم و پشتیوانی کردن لێی نەماوە.

لە گۆشەنیگای دەرەکییەوە، نەبوونی رەوایی و یاسایی نەبوونی رژێم دەبێتە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بۆتەمێ کردنی، هێندێ گەمارۆی ئابووری و سیاسی بخەنەسەری کە گەمارۆ ئابووری و سیاسییەکان دەبێتە هۆی ئەوە کە ئەم حکومەتانە لاواز بن. ئەم مەسەلە بۆ رژێمی نەژادپەرستی ئافریقای باشوور و دیکتاتۆری بۆرما رووی داوە. هەڵپەساردنی زیمبابۆی لە کۆی وڵاتە هاوبەرژەوەندەکانی ژێر پارێزگاری بەریتانیا لەساڵی٢٠٠٢ی ز. کاریگەرییەکی زۆری لەسەر بارودۆخی سیاسیی ئەم وڵاتە بوو، تا ئەو جێگایە کە لە وەرگرتنی ئەم حکومەتە وەکو ئەندامێك لەکۆی وڵاتە تازە بە سەربەخۆیی گەیشتووە دیموکراتیکەکان خۆیان پاراست. سەرەڕای ئەمە، گرووپە سیاسییە دژبەرەکانی رژێم لە بارودۆخێکدا کە حکومەت رەوایی خۆی لە دەست دابێ، لە ئاستی نێونەتەوەییدا بەئاسانی دەتوانن بۆ وەرگرتنی یارمەتییە ماڵی و مەعنەوییەکان هەنگاو هەڵێننەوە.

کەوابوو رەوایی بریتییە لە دەسەڵاتداری و مافێ کە لەسەر بنەمای ئەو، دەسەڵاتدار دەتوانێ، دادوەرییەکان، بڕیاردانەکان، تیۆرییەکان وشێوەی هەڵسوکەوتی تاکەکان و رێکخراوە جەماوەرییەکان رێنوێنی بکات. خەڵك بە پشتیوانی کردنی خۆیان، رەوایی بە دەسەڵات دەبەخشن و دوای بەفەرمی ناسینی دەسەڵات، لە دەستوور و یاساگەلێك پێڕەوی دەکەن کە لەلایەن دەسەڵات و بەیارمەتیی نوێنەران و رێکخراوە جەماوەرییەکان پەسندکراون و سەرەنجام لەگەڵ حکومەتدا هاوکاری دەکەن.

رەوایی، سەرچاوەی سەرەکیی هێزی سیاسیی دەسەڵاتدارە، بەڵام بەمانای دەسەڵات(هێز)ی سیاسی نییە.

**٢. سەرچاوە مرۆییەکان:**

نیشاندەری ژمارەی تاك و ئەو گروپانەیە کە لـە"یاسـادانەر" (بـەمانای دەسـەلاتێك کـە کۆمەڵگا بەڕێوە دەبا) پێڕەوی دەکەن و لە گەڵیـدا هاوکـاری دەکـەن، یـان لـە بـەڕێوەبردنی خواستەکانیدا یارمەتی دەدەن. سەرچاوە مرۆییەکان بریتین لە بەشێك لـە جۆرە کەسـانە یـان گرووپ گەلێك لەخەڵك _ بە لەبەرچاو گـرتنی رێـژە، چـینە کۆمەڵایەتییـەکان و رادەی ئـەو سەربەخۆییەی کە لە دەسەلات هەیانە.

هێزی یاسادانەر کاریگەریی خۆی لە دەست گەیشتن بەو سەرچاوە مرۆییانـەوە وەرگرتـووە کە یەکێك لە سەرچاوەکانی هێزی سیاسی پێکدێنێ.

رێژەی ئەو کەسانەی لە رژێم پشتیوانی یان لەگەڵیدا هاوکاری دەکەن یان بەهەر شـێوەیەك بەکەڵکن، یەکێك لە سەرچاوەکانی دابین کردنی هێزی دەسەلاتن. ئەم چەمکە بەو مانایە نییـە کە ئەگەر زۆربەی خەڵك لەو دەسـەلاتدارانەی کـە دەسـەلاتیان بەدەسـتەوەیە نـاڕازی بـوون، گۆڕینی حکومەت کارێکی سەلمێنراو و بەڵگەنەویستە، بەڵکو تەنیا بەم مانایەیە کە ئەگـەری گۆڕینی رژێم هەیە. مێژوو پڕە لە دەسەلاتی کەمینە بەسەر زۆرینەی خەڵکی ناڕازیـدا. بـەلام کاتێك زۆربەی خەڵکەکە ناڕازین و لە درێژەدان بە هاوکاری و بەرفەرمانی خۆدەبوێرن، ئەوکات بە بەرنامەڕێژییەکی رێکوپیك و خەباتی ئاشتیخوازانە دەتوانن حکومەتەکان سـەرەوژێرکەن. لە خەبات بۆ بەدیهاتنی دیموکراسی ئەو بەشـە لـە خـەڵك گرینگییـان هەیـە کـە خوازیـاری بەدەستهێنانی دیموکراسین.

**٣. زانست و شارەزایی:**

لە ئەمڕۆدا حکومەت کـردن زیـاتر لەهـەر کـاتێکی دی دژوار و پسـپۆڕانە بۆتـەوە. لـە سەرەتای سەدەی بیسـت و یەکەمـدا، سـەرکۆماری ولاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا وەکـو بەهێزترین سەرکۆماری جیهان دەناسرێ، بەلام ئەم بەهێزترین دەسەلاتدارە، لەسەر پاراسـتنی فڕۆکەکان، بەرنامەڕێژی کاتی فڕین، بەڕێوەبەری بازرگانی دەریایی، رێنوێنی کردنی پشـکنینە تاوانکارییەکان، کۆکردنەوەی بـاج، داڕشـتنی پلانـی شـەڕ، دابەشـکردنی خـۆراك، گەشـە و سەرپەرستی هێڵی پێوەندییەکان و بوارە تایبەتییەکانی دیکەدا زانیارییەکی کەمیان هەیە یان هیچ زانیارییەکیان نییە. خاڵی گرینگ ئەمەیە کە ئەو زانسـت و پسـپۆڕیەی کـە خـەڵك بـۆ بەڕێوەبەریی کۆمەڵگا لە ئاست و شێوازی جۆراوجـۆردا پێکـی دێـنن، وره بـە دەسـەلاتداران

دەبەخشێ تا وڵات بەرێوە بەرن و بەبێ بوونی زانست و ئەو پسپۆڕییەی کە لەلایەن خەڵکەوە ئامادە دەکرێ، دەسەڵاتداران ناتوانن کۆمەڵگا سەروسامان و ڕێکوپێك بکەن.

کەوابوو زانست و شارەزایی یەکێك لە سەرچاوەکانی دەسەڵاتی سیاسییە. هێزی حکومەت لە ڕێگای پسپۆڕییەکان، تەکنیك و ئەو توانایییەی کە تاکەکان وگرووپەکانی کۆمەڵگا(سەرچاوە مرۆییەکان) هەیانە و هەروەها لەو پێوەندییەی لە نێوان ئەواندا هەیە دابین دەکرێ.

**٤. هۆکارە نادیارەکان:**

هۆکارە نادیارەکان بریتین لە ئایین، بیروباوەڕی دەروونیی تاکەکان وتێگەیشتنی ئەوان لە گوێڕایەڵی و پێڕەوی کردن لە دەسەڵاتداران، هەست بە بەرپرسایەتی کردنی خەڵك و بایەخە فەرهەنگییەکان.

هەڵبەت روونکردنەوەی ڕادەی گرینگیی هەریەك لەم بابەتانە دژوارە، بەلاّم ئەم بابەتانە لەسەر چۆنیەتی پێوەندی نێوان خەڵك و دەسەڵاتداران کاریگەری زۆریان هەیە. بۆ نموونە هۆکارێك کە بووەتە هۆی مانەوەی حکومەتی کلێسا لە قۆناغێکی زەمەنی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، ئاکامی باوەڕی خەڵك بەم بابەتە بووە کە قەشەکان نوێنەرانی خودا لەسەر زەوین وسەرپێچی لە فەرمانی کلێسا لە ڕاستیدا بێ فەرمانی و بێ بڕوایییە بە خودا. یان لە وڵاتی ژاپۆندا خەڵك وا بیریان دەکردەوە کە ئیمپراتۆر خاوەن خەسڵەتی خودا پاشاییە.[١]

لەو کۆمەڵگایانەدا کە خەڵك خاوەن وەها بیروباوەڕێکن، دامەزراندنی دەسەلاّتێکی دیموکراتیك زۆر ئەستەمە. لە سەدەی بیستەمدا نموونە گەلێك لە تێکەڵکردنی ئیسلام وەکو ئایین لەگەڵ هێزی سیاسیی دەسەلاّتداردا(بەشێوە نەریتییەکەی) بووە. هەموو ئەم بابەتانە لە بناغەڕا هاومانان لەگەڵ ئەم بیروباوەڕەدا کە" هەموو شتێك ڕادەست و فیدای خواستی سەرکردەکان کەن، چونکوو هەموو شتێك سەربەوانە" لەسەر بنەمای ئەم باوەڕە بەرژەوەندیی تێکڕای تاکەکانی کۆمەڵگا خراوەتە دوای بەرژەوەندیی دەسەلاّتدارانەوە و خەڵکیش لەژێر سێبەری ئایینی و خوایی ئەواندا ژیان دەکەن. لە حاڵێکدا بیرۆکەی دیموکراسی لەسەر بنەمای

(١) لەفەرهەنگی ئێرانییەکانیشدا لەکۆنەوە شاکان خۆیان بە سێبەری خودا لەسەر زەوی دەزانیو هێزی خۆیان لەو دەزانی.بۆ زانیاری زیاتر سەردانی کتێبی"ما چگونە ما شدیم"یان(ئێمە چۆن بووینە ئێمە) لەنووسینی سادق زیباکەلام.و

ئەم باوەڕەیە کە دەسەلاّتی دەسەلاّتداران ئەمانەتێکە کە لەلایەن خەڵکەوە بەشێوەی کاتی بەوان دراوە و هیچ تاك یان گرووپێك بەهیچ پاساو یان بانگەشەیەك ناتوانێ ئەم دەسەلاّتە کەسێنی و تاکی کاتەوە.

### ٥. سەرچاوە مادی و داراییەکان:

سەرچاوە مادییەکان یەکێکی دیکە لە چاوگەکانی دەسەلاّتی سیاسییە و لەسەر داراییەکان، سەرچاوە سروشتییەکان، سەرچاوەکانی پارە، سیستەمی ئابووری، داهاتی کۆمەڵگا و شێوازەکانی ئاڵوگۆڕکردن ئاماژەی هەیە. ئەو رادە کە یاسادانەر لەسەر ئەم سەرچاوانە کۆنترۆڵی هەیە لەسەر دەست نیشان کردنی رادە یان چوارچێوەی دەسەلاّتی یاسادانەر کاریگەرە.

بەکۆبوونەوەی دەسەلاّتی ئابووری لە دەست حکومەتدا و نەبوونی نوێڵی ئابووری لە دەست خەڵکدا، دەسەلاّتداران دەتوانن لەم هێزە بۆ گوشار خستنە سەر خەڵك لە بابەتە سیاسییەکاندا کەڵك وەرگرن و خەڵکیش کەمتر دەتوانن بە ئامرازی ئابووری لە مافی خۆیان بەرگری بکەن، چونکوو ئەم کەرەستەیە لە دەستی دەسەلاّتداران دایە. هەرچی حکومەت لە کاروبارە ئابوورییەکاندا کەمتر دەست تێوەردان بکا و خەڵکیش زۆرتر دەستبەسەر ئەم کارانەدا بگرن، لە کاتە قەیراناوییەکاندا، خەڵك و رێکخراوە مەدەنییەکان باشتر دەتوانن لە هێزی ئابووریی خۆیان بۆ گوشار هێنانی سیاسی بۆسەر حکومەت کەڵك وەرگرن.(1)

دەستەواژەی "شمشاڵژەن،ە کە گۆرانیبێژ دێنێتە خوێندن" زیاتر لە هەر شتێکی دی لەسەر بابەتە سیاسییەکان لە راستییەوە نزیکە. کۆنترۆڵ کردنی ئابووری، داراییەکان، سەرچاوە سروشتییەکان، راگەیاندن و حەمل و نەقل یەکێك لە لایەنە گرینگەکانی هێز لە کۆمەڵگا دایە. بۆنموونە حکومەتێك کە زەوییە کشت و کاڵییەکانی لە کۆنترۆڵ دایە و بەڕێوەی دەبا، دەتوانێ لەسەر لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی وەرزێران و بنەماڵەکانیان چاودێری بکات. بەشێوەی لێك چوو، کاتێك حکومەت تەوای ئامرازەکانی راگەیاندنی لە دەستدا بێت، ئەگەر بێت و حەز لە سانسۆر بکات دەتوانێ سەرەڕای چاودێری لەسەر بیروباوەڕی خەڵك، ژیانی تایبەتی و پێوەندییەکانی رۆژنامەنووسان و نووسەرانیش کۆنترۆڵ بکات. لەو ولاّتانەدا کە

---

(١) نادەوڵەتیکردن یەکێك لەهەنگاوە چاکسازیو مەدەنییەکانی دەوڵەتە کە هەڵدەستێتەوە بە دابەشکردنی هێز لەنێوان رێکخراوە مەدەنییەکاندا .و

پیشەسازیی نەوت خۆماڵی کراوەتەوە، حکومەت لە باری ئابوورییەوە کەمتر بە باجەکانی خەڵکەوە بەستراوەتەوە و هەر ئەم کەمی بەستراوە بوونەی حکومەت، دەبێتە هۆی کۆبوونەوەی هێزی ئابووریی حکومەت.

### ٦. قەدەغە کردنەکان:

تەمبێ کردن یان سزادان بەشێوەی بەکارهێنانی توندوتیژی یان ناتوندوتیژی، بەهۆی لادانی خەڵك لە پێڕەوی کردن لە قانون یان بەهۆی ئەنجامدانی کارێکی دوور لە چاوەڕوانی یان ئەنجامدانی چالاکییە قەدەغە کراوەکانەوە بەسەر خەڵکدا دەسەپێ.

قەدەغە کردنە ناتوندوتیژییەکان، کەمتر لە قەدەغە کردنە توندوتیژانەکان بە مەبەستی تەمبێ کردن بەهۆی نافەرمانییەوە کەڵکی لێ وەردەگیرێ و زیاتر بەمەبەستی دەست گەیشتن بە ئامانجێکی تایبەتەوە بەکار دەبردرێت. قەدەغە کردن یەکێك لەسەرچاوەکانی دەسەڵاتی سیاسیی حکومەتە.

توانایی ناچارکردنی خەڵك بە هاوکاریی و گوێڕایەڵی لە قانونی حکومی، کە بریتییە لە قانون و ڕێساکان، دەتوانێ بە پشتیوانی نەکردن، خۆبواردن لە هاوکاری و نەچوونە ژێرباری خەڵکەوە سنووردار ببێتەوە.

قەدەغە کردنەکان بۆ تەمبێ کردن و پێشگرتنی خەڵك لە کردەوەگەلێك سوودی لێ وەردەگیرێت کە دڵخوازی دەسەڵات نییە. سزادانەکان نابێ بەبێ هۆ، توندوتیژ و دژوار بن، ڕژێمە سەرەڕۆکان بۆ ڕازیکردنی خەڵك بە ملکەچی لە سزادانگەلێك وەك کوشتن، زیندانی کردن، دانەمەزراندنی تاکەکان، بڕینی مەعاشی خانەنشینی، بەربەست دانان بۆ دەرفەتەکانی خوێندن و پلەپێدانی پیشەیی، سنووردانان بۆ سەفەرکردن و نیشتەجێبوون، بەسەردا سەپاندنی باجی نادادپەروەرانە و تاقەت پڕووکێن لەسەر داراییەکانی خەڵك، بڕینی ئاوی خواردنەوە و هتد کەڵك وەردەگرن. لە زۆربەی ڕژێمە دیکتاتۆرەکاندا ڕۆژنامەکان ومیدیاکان دەست دەکەن بە خۆسانسۆریی چونکوو لە ئەگەری دژایەتیی لەگەڵ حکومەتدا، دادەخرێن. لەم جۆرە ڕژێمانەدا بەهۆی نەبوونی رادیۆ و تەلەفزیۆنی سەربەخۆ، هەواڵ ناردن کۆنترۆڵ دەکرێت. تێکڕا ئەم سنووردانانە پێشێلکردنی مافی مرۆڤە. قەدەغە کردنەکان ئامرازێکن کە هەر حکومەتێك بەکاری دێنێ. ئەم سزادانانە زۆربەی کاتەکان بۆ پێشگرتن لە تاکەکان لە ئەنجامدانی کردەوەگەل نەشیاوی کۆمەڵگا و هەرزەکارییەکان بەکار دەهێنرێت"

بەلاّم هێندێ جار رژێمەکان بۆ ترساندنی خەلّك لەپێناو ئامـانجێکی سیاسیشـدا کـەلّکی لـێ وەردەگـرن. بـۆ نموونـە نازییـەکان لـە سـزادانە بەکۆمەلّـەکان بـۆ پێشـگرتن لـە چـالاکییە شیمانەییەکانی تۆڕە شاراوەکانی دژ بەداگیرکاریی نازییەکان کەلّکیان وەردەگرت. هێشـتا لـە سەدەی بیستەمدا رژێمی داگیرکەری ئیسرائیل لـە یاسـاغ کردنـە بەکۆمەلّـەکان بـە بیـانووی پێشگرتن لە تیرۆریزم کەلّك وەردەگرێ. سەرەڕای ئەوە کە بەکارهێنانی ئەم قەدەغـە کردنانـە پێشێلکردنی ئاشکرای مافی مرۆڤە، کەلّك وەرگرتن لەوانە وەکو شێوازێکی پێشگیرانە جێگەی پرسیارە، چونکوو لەوانەیە لەجێگەی ئەوەی کە لە کردەوە توندوتیژەکانی داهـاتوو پێشـگیری بکەن، خۆیان ببنە هۆکارێك بۆ تۆلّەکردنـەوە و ئاکـامێکی چـاوەڕوان نـەکراوو پێچـەوانەیان لێبکەوێتەوە.

لەم بەشەدا دوو پێکهاتەی جیاوازی دەسەلاّت شرۆڤە کرا، کە یـەکێکیان لەسـەر بنـەمای پێکهاتەی دەسەلاّتخوازییە کە کۆکردنەوەی هێز لە دەست دەسەلاّتدا دادەنێ. لـەم مودێلـەدا، خەلّك بە دەسەلاّتەوە گرێدراون و تەنانـەت مـافی رەخنـە لەدەسـەلاّت و چاکسـازییان نییـە. دووهەمین مودێل، شێوازی پلۆرالیزمییە کە سەرچاوەکانی هێز(دەسەلاّت) لە نێـوان خەلّکـدا دابەش دەکرێ و خـەلّك توانـای بـەکارهێنانی بیروبـاوەڕ و خواسـتەکانی خۆیـان هەیـە. لـەم مودێلەدا بەپێچەوانەی مودێلی یەکپارچە، دەسەلاّت بە خەلّکەوە گرێدراوە.

لەم بەشەدا سەرچاوە شەش فاقەکانی دەسەلاّت(هێز) تـاوتوێ کـران. لـە بەشـی دواتـردا ئاورێك دەدەینەوە لە چۆنیەتی هاتنەدی و بەڕێوەچوونی ئەم سەرچاوەی هێزانە لە چوارچێـوەی دامەزراوەکان و رێکخراوە مەدەنییەکاندا کە پێیان دەلّێین"پالّشـتەکانی دەسـەلاّت"و پیشـان دەدەین کە چۆن دەسـەلاّتداران بـەم "پالّپشـتانـەوە گرێـدراون و بـەبێ ئـەوان، تەنانـەت لـە بەڕێوەبردنی چالاکییەکانی رۆژانەی "کۆمەلّگا"شدا کلۆلن.

## پالّپشتەکانی هێزی حکومەت:

دامەزراوە و رێکخراوەکانی کۆمەلّگا لەسەرچاوەکانی دەسەلاّت(کـە لـە بەشـی پێشـوودا شیکرانەوە) پێکهاتوون. دەرکەوتنی سەرچاوەکانی دەسەلاّت لە چوارچێوەی گرووپ، رێکخراو و دامەزراوەکاندا، دەسەلاّتداران یارمەتی دەدا کە کاروبارەکانی کۆمـەلّگا بەڕێوەبـەرن. هـەر حکومەتێك بە هێنـدێ لـە سەرچـاوەکانی دەسـەلاّت زیـاتر لـە سەرچـاوەکانی دیکـە پشـت ئەستوورە و هەر لەو کاتەشدا هـەولّ دەدا کـە پالّپشـتی هێـزی دژبـەران سـنووردار کاتـەوە.

لەخەباتە جەماوەرییە ناتوندوتیژییەکاندا، سەرنجی بەرنامەدارێـژەران بـە پاڵپشـتەکانی هێـز، تواناییەکان و سەقامگیری ئەم تەکیەگاگەلە بنەمایەکی گرینگ و پێویستە.

## پاڵپشتەکانی دەسەلات(هێز):

پاڵپشتەکانی دەسەلاْت بریتین لە ڕێکخراوە مەدەنییەکان و بەشگەلێك لە کۆمەڵگا کە بە دابینکردنـی سەرچـاوەکانی هێـزی پێویسـتی دەسـەلاْت، پـارێزەری مانـەوە، بـەردەوامی و درێژەدانی دەسەلاْتن.

ئەم پاڵپشتانە بریتین لە پۆلیس، گرتنگەکان و هێزی ڕێککـاری کـە بـە سـەرکوتگەری و سزادانی خەڵکەوە خەریکن، ڕێبەرانی ئەخلاقی و ئـایینی کـە ڕەوایـی بـە دەسـەلاْت دەدەن، گرووپە کرێکارییەکان، سەوداگەرەکان، سـەرمایەگوزارەکان کـە سەرچـاوە ئابوورییـەکان بـۆ حکومەت دابین دەکەن و هەروەها سەرچاوەکانی دیکەی دەسەلاْتی سیاسی کـە گرینگترینیـان "پشتیوانیی جەماوەر و پشتگیرییان لە دەسەلاْتەوەیە.

## پۆلیس و هێزە ڕێککارەکان:

ناسین و شرۆڤەکردنی پاڵپشتەکانی دەسەلاْت هەنگاوی یەکەمە بۆ دەستپێکردنی خـەباتی دژبەرانی هـەر رژیمێـك، چـونکوو تـا ئـەو کاتـەی پاڵپشـتەکانی دەسـەلاْتی رژیمێـك لاواز، ناکاریگەر یان نەڕووخاون، ئومێدێکی زۆر کەم بە گۆڕانکاریی یان چاکسازیی سیاسی هەیـە. لە خەباتی ناتوندوتیژی لەگەڵ حکومەتە سەرەڕۆکاندا سەرنجدان بەو دامەزراوە و ڕێکخراوانـە زۆر جێگای بایەخن کە دەرخەر و دابینکەری هێزی ئـەو دەسـەلاْتەن. هەسـتێکی هاوبـەش و تێگەیشتنێکی گشتی بەم شێوەیەیە کە کاتێك گەندەڵی و فەساد بوو بە بەشێك لە پێکهاتەی حکومەت، ئەوکات چاکسازیی بێ گۆڕینی رژێم ئەگەر نەڵێین مەحاڵـە، زۆر ئەسـتەم دەبێـت. تەنانەت لە رژێمە دیموکراتیکەکانیشدا کە گەندەڵی تێکەڵ بە پێکهاتەی ئاسایشـییان بـووە، تەنیا ئەو کاتە چاکسازی مەیسەر دەبێت کە ئەو کەسانە وەلا بنرێن کە لە سێبەری ڕێکخراوە ئەمنییەکاندا، لەو دەسەلاْتەی کە پێیان دراوە بۆ گەندەڵی و دزێتی کەڵك وەردەگـرن. لایـەنی ئەرێنی ئەم مەسەلە کە پێکهاتە ئەمنییەکان، لەژێر چاودێری ڕێکخراوە مەدەنییەکانـدا بـن، ئەمەیە کە خەڵك دەتوانن چاودێری کردەوەی ئەو دەزگایا نە بکەن و کەسانێك بێننـە سـەرکار کە بۆ وەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانی ئەوان هەنگاو هەڵدێننەوە. بەلاْم ئەو کاتـە کـە ئۆرگانـە

ئەمنییەکان لە کۆنترۆڵی دەسەڵاتداراندا بێت، دەربڕینی بیروڕا لەسەر کردەوەیان و شوێندانەری لەسەر شێوازی بەڕێوەبەریی ئەوان بۆ خەڵکی ئاسایی ئەستەم دەبێت.

لەو کۆمەڵگایانەدا کە هێزە ئەمنییەکان وەکو تەنیا ڕێگای مانەوەی حکومەت نەناسراون و تەنیا ئەرکی ئەوان پارێزگاری لە ئاسایشی خەڵکە نەك گەرەنتی مانەوەی حکومەت، ئیتر خەڵك بۆ لابردنی دەسەڵاتداران نابێ لەپێشدا چاوەڕوانی گۆڕینی ئاکار و کرداری هێزە ئەمنییەکان بن. چونکوو لەم کۆمەڵگایانەدا هێزە ئەمنییەکان لەناو خەڵکدا دەژین و ئەندامانی بنەماڵەکانیان، خزم وکەس و کاریان، ناسیاو و هەڤاڵانیان تۆڕێکی پێوەندیی جەماوەری(لە قوتابخانە، کاروباری بازرگانی، ڕێکخراوە ئایینییەکان و...) لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایەدا پێك دێنن. لەم دۆخەدا ئەگەر بێت و دەسەڵاتداران دژبەرانی سیاسیی خۆیان بە تاوانبار، تیرۆریست یان سیخوڕ بناسێنن، هێزە ئەمنییەکان بەهۆی خەڵکی بوونی خۆیانەوە، دتوانن لەسەر ئەو پڕوپاگەندەیەی حکومەت باشتر داوەری بکەن. لە هێندێ لەوڵاتەکاندا، تەنانەت هێزەکانی پۆلیس بۆ پووچەڵ کردنەوەی سەرکوتگەرییەکانی حکومەت، دەستیانداوەتە هاوکاریکردنی خەڵك. لەم کۆمەڵگایانەدا هێزە ئەمنییەکان بەهۆی ئەوە کە کردەوەکانیان لەلایەن خەڵکەوە کۆنترۆڵ دەکرێت، زۆرتر پشتیوانی لە بەرژەوەندیی نەتەوەیی دەکەن تا بەرژەوەندیی حکومەت. لە حاڵێکدا لە ڕژێمە سەرەڕۆکاندا ئەم هێزانە مانەوەی حکومەت گەرەنتی دەکەن و بۆ ئەوەی کە حکومەت لەئەمەگداریی ئەوان خاترجەم بێت، پوانگەلێکی تایبەتییان پێدەبەخشێ. (١)

خاڵی جێگای سەرنج لەخەباتە جەماوەرییە ناتوندوتیژییەکاندا ئەمەیە کە کاتێك خەبات لە سەرکەوتنی بڕگەیی یان کۆتایی نزیك دەبێتەوە، دەبێ خەڵك بۆ ڕاکێشانی هاوکاریی هێزە ئەمنییەکان هەوڵ بدەن و ئەوان وەکو دژبەرانی خۆیان سەیر نەکەن، بەڵکو بزانن کە ئەوان تەنیا هێزێك لە خزمەت سەرەڕۆییدا بوونە و ئێستا دەتوانن لە خزمەت حکومەتی خەڵکی و

(١) حەسەن قازی مورادی لەکتێبی "استبداد درایران" واتە"سەرەڕۆیی لەئێران"دا چاوێك دەخشێنێتە چۆنیەتی پەیدابوونی هێزە موزدوریان خۆفرۆشەکانو رۆڵی ئەوان لەپشتیوانیو مانەوەی حکوومەتەکانی ئێرانداو بەهەڵسەنگاندنی ڕەوتی جاشپەروەری، نیشان دەدا کە زۆربەی حکوومەتەکان هەر لەرێگای ئەم بەکرێگیراوانەوە کە بەوەرگرتنی پوانگەلێکی تایبەت ئەرکی پشتیوانی کردن لەحکوومەتیان لەئەستۆ بووە، لەبەین چوونە.و

لەژێر چاودێری ڕێکخراوە مەدەنییەکاندا کار بکەن. هەڵبەت سزادانی ئەو کەسانە کە لە کوشتن، ئەشکەنجە و تالانکردنی خەڵکدا بەشدار بوونە، پرسێکی جیاوازە.

لەهەرحاڵدا هێزە ئەمنییەکان یەکێك لەپاڵپشتەکانی هێزی دەسەلاتن کە دەبێ خەڵك چاودێری کردەوەکانی ئەوان بکەن تا نەبنە ئامرازێك بۆ بە ئاکام گەیشتنی ئامانجە بەرژەوەندی خوازانەکانی دەسەلاتداران و هەروەها لە کاتی خەباتی ناتوندوتیژیدا، دەبێ بۆ ڕاکێشانی سەرنجی ئەو هێزانە بەلای خۆیاندا هەوڵ بدەن.

## سوپا:

کەڵك وەرگرتن لە سوپا بۆ گوشار خستنەسەر خەڵك لە پێناو پاراستنی دەسەلات "تاکە خاڵ"ی دەسەلاتە سەرەڕۆکانە. بەپێچەوانەی هێزە ئەمنییەکان کە لەناو کۆمەڵگادا و لەگەڵ خەڵکی ئاساییدا دەژین، هێزەکانی سوپا بەتەوای لەوان جیاوازن و تەنانەت لە ئامرازەکانی خوشگوزەرانی وەك خانوو، قوتابخانە و نەخۆشخانەی تایبەت سوودمەندن. لەحکومەتە سەرەڕۆکاندا، ئەم جیاکردنەوەیە بۆ دروست نەبوونی پێوەندی لە نێوان هێزەکانی سوپا و خەڵکی ئاساییدایە. لە حاڵێکدا لە حکومەتە دیموکراتیکەکاندا ئەگەر بێت و دەسەلاتداران بیانەوێ بۆ سەرکوت کردنی دژبەرانی خۆیان لە سوپا کەڵك وەرگرن، ئەم هێزانە پاڵنەرێکی ئەوتۆیان بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی لەسەر خەڵك نییە.

بۆ نموونە لە مانگرتنە گشتییەکان لەساڵی۱۹۸۸ی ز. لە وڵاتی بۆرما و ساڵی دواتر لە وڵاتی چین، حکومەت بە ئاگاداری لەم بابەتە، بۆ سەرکوتکردنی خەباتگێڕانی جەماوەری لە ناوچە جیاجیاکاندا، لە هێزە ئەمنییەکانی ناوچەکانی دیکە یان تەنانەت بێگانە کەڵکی وەردەگرت. لە هێندێ لەوڵاتاندا تەنانەت لە هێزە نهێنی و نادیارەکانی پێکهاتو لە نەتەوەکانی دیکە بۆ سەرکوت و تۆقاندنی خەڵك سوود وەردەگیرێ، چونکوو ئەم هێزانە لەهێزە خۆماڵی و نەتەوەییەکان، ملکەچ تر و جێ‌متمانەترن و بەهۆی نەبەستراوەیی بە کۆمەڵگاوە، ئامادەن بۆ ئەنجامی هەرکردەوەیەك.

لە خەباتە جەماوەرییەکاندا، ڕێبەرانی خەبات پێش لە دەستپێکردنی ناڕەزایەتییەکان دەبێ هەوڵ بۆ تێکدانی وەفاداری و بەرفەرمانیی هێزە سەربازییەکان بدەن لە بەرانبەر دەسەلاتدارانی سەرەڕۆ و بەرلەوەی کە دەسەلاتداران ئەم هێزانە بۆ سەرکوتی خەڵك بەکار بێنن، خەڵك ئەو هێزانە لە ئامانجی خەباتەکەی خۆیان ئاگادار بکەنەوە و بە کاریگەری دانان

و هاندانی ئەوان، بەقازانجی خەباتەکەی خۆیان بیانهێننە مەیدانەوە، هەڵبەت ئەم ئامانجە لە قۆناغێکی زەمەنی کورتدا نایەتەدی.

لەم پێناوەدا، بزووتنەوەی خەباتی جەماوەری دەبێ متمانە بە سوپا و هێزە نیزامییەکان بدا کە ئەوان لە حکومەتی دیموکراتیکی داهاتوودا لە مافی شارۆمەندیی بەرانبەر سوودمەند دەبن و بوونی ئەوان وەکو "پاڵپشتی دەسەلاَت"ی حکومەت پێویستە.

دژکردەوەی هێزەکانی سوپا لە بەرانبەر بڕیارە نیزامییەکاندا، بە رادەیەکی زۆر بە ئاکار، کردار و تواناییەکانی رێبەرانیان بەستراوەتەوە، زۆرجار ئەفسەرانی نیزامی خۆیان وەکو هێزێکی نیشتمان پەروەر، وەفادار بە ئارمانجەکان و لەباری سیاسیشەوە کۆنە پارێز دەزانن، لەم تایبەتمەندییە هێندێجار کەڵکی نابەجێ وەردەگیردرێ و دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەوان بەبێ فیکر و هزر لە هێندێ بڕیار بۆ پشتیوانی لە گرووپێکی تایبەت پێڕەوی بکەن.

لە هێندێ ولاَتاندا، دەسەلاَتداران بەهۆی جێی متمانە نەبوونی هێزەکانی سوپا بەهۆی هێندێ مەیلی نیشتمان پەروەرانەوە، هەوڵ دەدەن هێزێکی هاوتەریبی سوپا بە بیروباوەڕ و وەبەرنانی ئارمانجگەلێکی جیاوازەوە دروست بکەن.

لەسەردەمی هیتلەردا، فەرماندە نیزامییەکانی ژێر فەرمانی ئەو لەراپۆرتگەلێکی یەك لەدوای یەکدا سەبارەت بە سیاسەتەکانی ئەو دژایەتییان دەکرد، بەلاَم بەم حاڵەشەوە بەردەوام لەپێناو سیاسەتەکانی پێشەوادا هەنگاویان هەڵدەهێنا.(١)

دەروونی کردنەوەی بایەخەکانی دیموکراسی لە ناخی سوپادا و تێکەڵکردنی لەگەڵ فەرهەنگی نیزامیدا، رێکارگەلێکی بنەڕەتی و گرینگ لە سنووردارکردنی توانای تێکدانی سوپا لەراستای شارستانی بوون و بایەخە مەدەنییەکاندایە. هۆکارێکی دیکە، خستنە مێشکەوەی ئەم تێگەیشتنەیە (ادراك) بە رێبەرانی سوپا کە ئەوان لە چوارچێوەی چاودێری جەماوەریدا یەکێك لە هۆکارەکانی مانەوەی حکومەتی دیموکراتیکن. ئەم دوو بابەتە پێویستیی بە کات و تێڕامانێکی زۆر لە پەرەپێدانی فەرهەنگ و هاندان بە بیرکردنەوە لەسەر ئەم بیرۆکانە و بڕواپێکردنیان هەیە.

---

(١) خاڵی گرینك لەسەر هیتلێرو وڵاتی ئەڵمانیا ئەوەیە کە ئەو لەرێگای هەڵبژاردنێکی جەماوەریو یاساییەوە وەکوو نوێنەری پارتی زۆرینە بەدەسەڵات گەیشتبووو حکوومەتەکەی ئەو یاسایی دەهاتەبەرچاو کە ئەمە خۆی هۆیەك بوو بۆ ئەوەی هێزە وەفادارە ئەرتەشییەکان دژایەتیی نەکەن. چونکوو ئەوان هیتلێریان بە وەك نوێنەری خەڵك دەناسی.ن

یەکێك لەو هۆکارانە کـە بزووتنـەوەی جـەماەریی ناتوندوتیـژیی سرپسـتان زیـانێکی زۆر کەمی بەرکەوت ئـەوەبوو کـە کاتێـك خـەڵك لـەناو پەرلەمانـدا بـە نیشـانەی نارەزایـەتیی کۆبوونەوە، هێزەکانی سوپا، سیاسەتی دەست تێوەرنەدان لـە کاروبـاری سیاسـییان گرتەبـەر. یەکێك لە هۆکارەکانی دەست تێوەرنەدان، سەرکەوتنی زۆر نزیکی بزووتنەوەی جەماوەری(کـە رێکخستنێکی باشی بوو) بوو و هێزەکانی سوپاش زۆر حەزیان لێ بوو کە هاوکاری و بەشداری بکەن لەو حکومەتە دیموکراتیکە کە بۆ جێگرەوەی دیکتاتۆر میلۆسۆڤیچ دەهاتە ئاراوە. ئـەم کارە نیشانەی ئەوەیە کە بزووتنەوەی خەڵکی سرپستان، فەرهەنگی دیموکراسی خوازی تا ئـەو رادەیە لە کۆمەڵگادا بەهێز و پتەوکردبوو و پەرەی پێدابوو کە تەنانـەت هێزەکـانی سـوپایش ئاواتە خوازی هاتنە سەرکاری حکومەتێکی جەماوەری بوون.

## پسپۆران و بەرێوەبەرانی خزمەتگوزارییە جۆراوجۆرەکان:

لە کۆمەڵگا سەرەرۆکاندا، تاکەکانی ئەم چینانە (فەرمانبەران، ماموستایان و...) زۆرجار سەرکۆنە دەکرێن، گاڵتەیان پێ دەکرێ، رەخنە لە هەڵسوکەوتیان دەگـیردرێ و لـە رێزگـرتنی بەجێ و شایستە بێبەری دەکرێن.[1] دەسەلاتداران لەگەڵ تاکـەکانی ئـەم چـینەدا کـە زۆرتـر مووچەخۆری حکومەتن، وەکـو خـەڵکی ولاتێکـی داگیرکـراو (ئیسـتیعماری) هەڵسـوکەوت دەکەن.

هەزاران نەفەر لە کەسانی بێ ناونیشان کە لەناو کۆمەڵگادا بۆئەنجامدانی کارگـەلێك لـە ئاسـتێکی نزمـدا بـەکار دەهێنـرێن و بچـووکترین پشکیشـیان لـە بەشـداریی سیاسـی و کۆمەلایەتیی کۆمەڵگاکەی خۆیاندا نییە،[2] تەنیا کەشێکی ئازاد کە دەتوانن لەودا توانـا و لێ وەشاوەیی خۆیان پیشان بدەن، ئەو کەشە بەرتەسکەیە کە لەژێر چاودێری دەوروبەریاندایە. بەم حاڵەشەوە هەموو سیاسەتمەداران و دەسەلاتداران وەکو ئەو داگیرکەرانە کە ولاتەکان داگیر دەکەن، پێویستیان بە خزمەتگوزاری و چالاکی گەلێك هەیە کە ئەم کەسانە ئەنجامی دەدەن و

---

(١) ئەم سەرکۆنەو گاڵتەپێکردنە زیاتر لەباوەری سیاسەتمەدارانی ئـەم کۆمەڵگایانـەدا جێـی گرتـووە. ئـەوان بەهۆکاری جۆراوجۆر لەوانە جەماوەرخوازیو راکێشانی بـیرورای خـەڵك لـەم چـینە پشـتیوانی دەکـەن بـەڵام لەکردەوەدا ئەوانیان پێچووکەتر لەوەیە کە رۆڵێکیان لەگۆرانکارییە سیاسییە کۆمەڵایەتییەکاندا ببێ و

(٢) لەحکوومەتە سەرەرۆو توتالیتاریزمەکاندا، ئەم چینانە تەنیا لەچوارچێوەی پارتو شـووراگەلی بەسـتراوە بەدەسەڵاتەوە دەتوانن لەچالاکییە سیاسییەکاندا بەشدار بن.و

بـەبێ هاوکـاریی ئـەوان _ ئەوانـە کـە کارگـەلێکی بـە روواڵـەت سـاکار ئـەنجام دەدەن _ حکومەتەکەیان بەردەوام نابێ.

لە راستیدا ئەمانە وەرگێڕگەلێکن کە بیرۆکەکان بۆ راپەڕاندنی کارەکان وەردەگێڕنەوە، تێکڕای ئـەو چالاکییانە کە بەڕێوەبەریی کۆمەڵگا بـۆ دەسـەلاتداران مەیسـەر دەکـات، لەلایـەن ئـەم کەسـانەوە جـێبـەجێ دەبـێ، خزمەتگوزارییـە گشـتییەکانی گواسـتنەوە، بەڕێوەبـەریی کاروبـاری شـارەکان، خزمەتگوزارییـەکانی پێوەنـدی، هێڵـی بەرهـەمهێنانی کارخانـەکان، چـالاکییەکانی کشـتوکاڵ و ئاژەڵداری و... هیچ حکومەتێك ناتوانێ بەبێ ئەم خزمەتگوزارییانە درێژە بە دەسەلاتی خۆی بدات.

هەموو ئەو گرووپە دژبەرانە کە بۆ ریفۆرم یان گۆڕینی حکومەتێکی سەرەڕۆ لەگەڵ حکومـەتێکی دیموکراتیکدا بە شێوازی ناتوندوتیژی هەوڵ دەدەن ، پێویستە سەرنج بە گرینگیی رۆڵی ئەم چینە بـدەن و ئەم خاڵەشیان لەبەرچاو بێ کە، بەهۆی بارودۆخی  گوزەران و بەسـتراوەیی ئـابووریی ئـەم چـینە بـە دەسەلاتەوە و ئەوانەی ئەمانیان وەك فەرمانبەر بەکار گرتووە، تـەنیا بەشـێکی کـەمیان لـە قۆنـاغی سەرەتایی خەباتدا دەتـوانن بەشـداری بکـەن، مەگـەر ئـەوە کـە نیشـانەیەکی روون لـە تێکشـکانی بەشەکانی تری پشتیوانییەکانی هێزی دەسەلاتیان ببێت. بەم حاڵەشەوە ئەگەرچـی ئـەم گرووپانـە لـە رواڵەتدا ناتوانن پشتیوانیی خۆیان لە بزووتنەوەکە دەربڕن، بەلاّم لە کردەوەدا بـە شـێوەی سـنووردارتر سەبارەت بە ئامانجـەکـانی خـەبات هەسـت بەیارمـەتی و بەشـداری کـردن دەکـەن و ئـەوکاتـە کـە بەستێنێکی ئازادتر بۆ هاوهەنگاوی بڕەخسێت، تێکەڵ بە گرووپی خەباتگێڕان دەبن.

## دەزگاکانی راگەیاندن:

ئەگەر خەباتی جەماوەری _ بۆ دابینکردنی دیموکراسی _ لە هەوڵی گەیشتن بە سەرکەوتن دایە، پێویستە بۆ دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵ گوێگرانی خۆی رێگایەك بدۆزێتەوە. حکومەتە سەرەڕۆکان بە باشی لەم بابەتە ئاگادارن  و هەر بەم بۆنـەوە لـە هـەوڵی ئـەوەدان کەرەسـتەکانی پێوەندی گرتن بەرتەسك کەنەوە و لە بەرانبەر ئەوانەدا کە دەیانەوێ لە تەکنۆلۆژیای نوێ بـۆ بـە ئاگاهێنانەوەی خەڵك، کەڵك وەرگرن و هەروەها بۆ نەبوونی پێوەنـدیی ئـازاد لـەنێوان خەڵکـدا، یاسـاگەلێکی نیزامـی و دراکـو[1] وار دادەنـێن. بـۆ نموونـە حکومـەتی بۆرمـا بـۆ ئـەو سەرپێچیکارانەی کە بە بێمۆڵەت ئەم جۆرە کەرەستانە بەکار دێنن، یاساگەلێکی توندوتیژانـەی وەکو بەند  و زیندانی داناوە. لە هێندێ ولاتدا، سنوورگەلێکیان دانـاوە بـۆ کـەڵك وەرگـرتن لـە

---

(١) دراکو دادوەرێکی سەرەڕۆ لەیۆنانی باستاندا بوو کە هێمای دوژمنایەتی بوو. ن

موبایل و  دەسەلاتدارانیش دەستیان داوەتە سانسۆڕ و دروستکردنی بێ سەروبەریی و ئالۆزی لەبەرنامە تەلەڤیزیۆنی و رادیۆییە دەرەکییەکاندا کە دەیانەوێ بیروڕای گشتی هۆشیار کەنەوە.

سانسۆڕ و کۆنترۆڵی چاپەمەنی و ئامرازەکانی راگەیاندن دەتوانێ بە ئاسانی لەلایەن رژێمی سەرکوتگەرەوە بەڕێوە بچێ. لەم پێناوەدا، بۆ چاودێری بەسەر ناوەڕۆکی کتێب، گۆڤار و رۆژنامەکان پێش لەبلاوکردنەوە و دابەشکردنیاندا، رێکخراو و بنیاتگەلێکی تایبەت هەیە. ئەم مەسەلە بۆتە هۆی ئەوە کە نووسەران و پێنووس بەدەستان خۆسانسۆری بکەن، چونکوو دەزانن ئەگەر بێت و بابەتێك بنووسن کە لەلای دەسەلاتداران پەسەند نەکرێت، لەباری مالییەوە نرخێکی زۆر _ بە راگرتنی کتێب _ بە سەریاندا دەسەپێت و دەبێ خۆیان بۆ ئەگەری بەند و زیندانیکردن دابنێن.

رۆژنامەکان، راگەیاندنەکانی دیکە، ئێستگەکانی رادیۆ و تەلەڤیزیۆنیش بۆ ئیزن وەرگرتن، رێسا و قانونی تایبەت بە خۆیان هەیە کە ئەگەر بێت و لە  یاسای دیاریکراو لابدەن، دەزگاکانی ئەوان دادەخرێ و دەستی بەسەردا دەگیرێ و بەڕێوەبەران و کاربەدەستانیشی دەکەونە بەر هەڕەشە و لێدان وکوتان. بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم تەنگەژە و سنووردارییە کە زۆرتر لە ناوخۆی ولاتدا هەیە، ئەمڕۆکە کەلك وەرگرتن لەراگەیاندنە دەرەکییەکان زیاتر باو بووە، وەکو رادیۆی گرووپە دژبەرەکانی حکومەتی بۆرما کە لەولاتی نەرویج دا پەخش دەکرێت.

بزووتنەوەی دیموکراسیخوازی سربستان نموونەیەکی باشی لە خەبات لە رێگای راگەیاندنەکانەوە وەرێ خستووە. لەسالی٢٠٠٠ی زایینی، پێش لە دەستپێکردنی هەلبژاردنەکان لەم ولاتەدا، دژبەرانی حکومەت، نزیکەی ٦٠تەن بلاوکراوەیان بە کەشتی لەدەرەوەی ولاتەوە هێنایە ناوەوە و لە نێو جەماوەردا بلاویان کردەوە .

## نووسینگە تجاری(بازرگانی)یەکان:

تەنانەت لە سەرەڕۆترین ودەسەلاتخوازترین حکومەتەکانیشدا، نووسینگە بازرگانییەکان رۆلێکی زۆر گرینگ لە ئابووریدا دەگێڕن.

خزمەتگوزارییەکان و ئەو شت و مەکانەی کە خەلك پێویستیان پێیەتی و حکومەتیش ناتوانێ دابینیان کات، ئەوە نووسینگە توجارییەکان دابینی دەکەن. لە هێندێ بابەتدا دەسەلاتداران بە شێوەی لاوەکی، ئیزن بە بازاڕی رەش دەدەن کە کەلوپەلە نایابەکان دابین کەن، بۆئەوەی پێشگیری بکەن لە روودانی ناڕەزایەتیگەلێك کە جاروبار شێوەی سیاسی بەخۆیانەوە دەگرن.

پێوەندیی ڕێکخراوە جەماوەرییەکان لەگەڵ بنیات و کۆمپانیا نێونەتەوەییەکاندا لەو سۆنگەوە کە لەگەڵ فەرهەنگ و پێکهاتەی سیاسیی وڵاتەکاندا ئاشنا دەبن زۆر بەنرخ و کاریگەرە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە کۆمپانیا نێونەتەوەییەکان ئەوە بەباش دەزانن کە زیاتر لەگەڵ حکومەتە سەرەڕۆکاندا ئاڵ وێر بکەن تا لەگەڵ حکومەتە دیموکراتیك و جەماوەرییەکاندا ( بەداخەوە زۆربەی کۆمپانییە نێونەتەوەییە گەورەکان بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی خۆیان لەوڵاتانی جیهانی سێهەمدا لە حکومەتە سەرەڕۆکان پشتیوانی دەکەن ) چونکوو لەو جۆرە حکومەتانەدا بەهۆی وەڵامنەدانەوەی دەسەڵاتداران بە خەڵك، کۆمپانیا نێونەتەوەییەکان بە ئاسانی دتوانن بە تەماح وەبەرنانی دەسەڵاتداران، گرێبەستگەلێکی یەکلایەنە بە قازانجی خۆیان ببەستن یان ڕقەبەرەکانی خۆیان ( تەنانەت ئەگەر لە ناوخۆی ئەو وڵاتەشدا بن ) وەدەر نێن. دەسەڵاتدارانی سەرەڕۆ سەرچاوە مرۆیی و داراییەکانی خۆیان بۆ ئەم کۆمپانیاگەلە دابین دەکەن و لە بەرانبەردا کۆمپانیاکانیش لەکۆمەڵگای نێونەتەوەییدا بە کەڵك وەرگرتن لە پێگەی خۆیان، لە مافی دەسەڵاتدارێتیی ئەم ڕژێمانە پشتیوانی دەکەن.[1] لەهەر حاڵدا کۆمپانیا و ئاژانسە نێونەتەوەییەکان لەسەرەتادا قازانجی خۆیان لەبەرچاو دەگرن و هیچ گرینگییەك بە سەرەڕۆ بوون یان دیموکرات بوونی ئەو حکومەتانە نادەن، ئەمە خاڵێکی گرنگە کە دەبێ ڕێبەرانی خەباتە جەماوەرییەکان سەرنجی بدەنێ و بە ڕاوێژکاریی خۆیان، ئەو کۆمپانیاگەلە دڵنیا کەنەوە کە لە داهاتوودا بەرژەوەندییەکانی ئەوان پارێزراوە. هەڵبەت ئەم مەسەلە لەو سۆنگەوە کە پێوەندی بە قازانجێکی سەرسووڕهێنەری ئەم کۆمپانیاگەلەوە هەیە زۆر ئاڵۆزە و ڕەنگە ئەم کۆمپانیاگەلە هەرگیز پێیان خۆش نەبێ ئەم ڕژێمانە بگۆڕدرێن و لەم ڕوووەوە بۆ خەباتی جەماوەریش کێشە بنێنەوە. بۆنموونە لە گۆڕەپانی نێونەتەوەییدا، لەوانەیە وڵاتەکەیان هان بدەن پشتیوانی لەو حکومەتە سەرەڕۆیە بکات کە لەگەڵیدا گرێبەستیان هەیە.

بەڵام ئەگەر بێت و ڕێبەرانی خەباتی جەماوەری بتوانن بنکە بازرگانی _ ئابوورییەکانی ناوخۆیی و دەرەکی بە قازانجی خۆیان بخەنە گەڕ، یارمەتییەکی زۆر بە پرۆسەی خەباتەکە

(١) دەتوانین بۆ نموونە ئاماژە بە هاوکاری دەوڵەتی ئوتریش لەگەڵ بکوژانی ڕێبەرانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران شەهیدان دوکتور قاسملووو عەبدوڵڵا قادری ئازەرو فازڵ ڕەسوڵ بکەین کە تەنانەت تیرۆریستانیشیان بە ڕێزەوە تا تاران ئیسکۆرت کرد.ئاماژەیە بە فرۆشتنی کەرەستەی جەنگی ئوتریش لەرێگای کۆمپانیای "نۆریکۆم"ەوە. وەگێڕ بۆ کوردی

دەدەرێ، چونکوو ئەوان بەو پێوەندییە خۆماڵی، ناوچەیی و نێونەتەوەیەی کە هەیانە، دەتوانن سەرچاوەیەکی باشی دارایی، زانیاری و راوێژکاریی گرینگ و کارلێهاتوو لە خزمەت گرووپە خەباتکارەکان دابنێن.

## لاوەکان پێشگیری بکەن:

یەکێك لەنگەرانییە سەرەکییەکانی حکومەتە سەرەڕۆکان ئەوەیە کە ئیزن نەدەن لاوەکان بەلای سیاسەتدا بچن و ئەگەر مەیلێکیشیان بۆ سیاسەت هەبێ، ئەوە دەبێ لەژێر چاودێری و پشتیوانی و بەقازانجی دەسەڵات بێ. لەم رووەوە کە ئەم حکومەتانە بەهۆی ئەو ترسەی کە لە پێگەی خۆیان هەیانە، پێشگری دەکەن لە هۆشیاری لاوەکان و بەرەو سیاسەت چوونیان، گرووپە سیاسییە بەرهەڵستکارەکان، لە تەیارکردنەوە و بەهێزکردنی خۆیان بە یارمەتی پێش قەرەوڵە ماندوونەبووەکان دوا دەکەون. ئەم حکومەتانە بۆ پێشگیری لە تێکۆشانی سیاسیی لاوەکان، دەست دەدەنە سنووردانانێکی تایبەت، وەکو بێبەری کردنی چالاکانی سیاسیی لاو لە دەستگەیشتن بە پێگەی خوێندنی باش، رێ نەدان بۆ کۆبوونەوەی خوێندکاری لەناو زانکۆکاندا، یان داخستنی زانکۆکان لە ماوەیەکی زەمەنی تایبەتدا.[1] لەم جۆرە وڵاتانەدا یاساگەلێکی دژوار بۆ پێشگرتن لە وتاردانی ئازاد یان کۆبوونەوەی سیاسی دادەنرێت و لە ئەگەری پێشێلکردنی ئەم یاسایانە، بۆ تاوانباران سزای زیندانی درێژماوە یان سزاگەلێکی هاوشێوە دادەنرێ.

زۆرێك لە خەڵك هەوڵیان داوە هۆی پێشەنگی لاوەکان لەرێگای خەباتدا، لەم رستەدا کورت کەنەوە کە لاوەکان شتێکیان بۆ لەدەستدان نییە. بە تەواوی ئەم وتە راستە کە لاوەکان کەمتر بە کار و پێگەی خۆیانەوە بەستراونەتەوە، یان بەرپرسیارێتییەکی بنەماڵەیی کەمتریان هەیە و هەروەها زۆر حەزیان لەوەیە کە توانا" گەنج"ێتییەکانی خۆیان پیشان بدەن، یان لە خۆخستنە مەترسی کەمتر ترسیان هەیە، بەلاّم ئەمە تەنیا بەشێك لەو شتانەیە کە لاوەکان بۆ خەبات هاندەدات، چونکوو لاوەکان خۆشترین قۆناغی تەمەنی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە و لەوانەیە ژیان و داهاتووی خۆشیان لە دەست بدەن، بەلاّم ئەوان بیر لە شتگەلێك ناکەنەوە کە لەوانەیە لەدەستی بدەن، بەڵکو بیر لە ژیان لە سێبەری ئازادی و بەختەوەری بۆ نەوەکانی

---

(١) وەکوو داخستنی زانکۆکان لەسەرەتای هاتنەسەرکاری کۆماری ئیسلامی لەئێران کە بەناو شۆڕشی فەرهەنگی ناوی دەرکرد. وەرگێڕ بۆکوردی

داهاتوو دەکەنەوە، ئەمەیە ئەو شتەی کە ورەیەکی سەد قاتیان بۆ خەبات پێدەدا. لاوەکان بەبێ هۆ پاساو بۆ بەندەیی خۆیان لە ژێر رکێفی حکومەتە سەرەڕۆکاندا ناهێننەوە و تەنانەت بەم هۆیەوە قبووڵی ناکەن کە قبووڵکردنی ئەم حکومەتە جۆرێك ناچارییە و گۆڕینیشی مەحاڵە. ئەوان ورە و شەوقێکی لاوییان تێدایە کە هێشتا لە تاقیکردنەوەی ژیان و تێپەڕینی تەمەندا لاواز نەبووەتەوە. مەیلی ئەوان بە ناسینی راستی لە درۆ و حەقێقەت لە فێڵ و مەکر، بەشێوەی ئامانج خوازانە و نەك پۆلێن بەندی و پاساو هێنانەوە بۆی، هەر هەمان ویژدانی بەخەبەرە کە ئەوان بۆ ئەم کارە هان دەدات.

وشەی بە بیرکردنەوە کارکردن، ئەو شتەیە کە لاوەکان لە پرۆسەی خەبات بۆ دابینکردنی حکومەتی دیموکراتیکدا، دەبێ سەرنجی پێ بدەن، چونکوو ئەوان وەکو کەسانێك کە پێشەنگن بۆ مەترسی قبووڵ کردن و ئالاهەڵگرانی دابینکردنی کۆمەڵگای دیموکراسی دێنە ئەژمار.

بێ سەرنجدان بە پێکهاتەیەکی دارێژراو و رێکخراوەیی، لەوانەیە لاوەکان لە پرۆسەی خەباتدا تووشی زێدەڕۆیی بن و ئەگەر بێت و توشی ورووژانی بێلۆژیك بن، توندوتیژی دەنوێنن و هەرهەمان کارێك ئەنجام دەدەن کە کەسانی بەستراوە بە حکومەتە سەرەڕۆ و دژە مرۆییەکان بەرێوەی دەبەن.

کردەوەی بەرنامە دارێژراو بۆ تێکرا ئەوکەسانەی کە لە خەباتدا بەشداری دەکەن حەقێقەتێکی بنەڕەتییە و بۆ لاوەکان بنەڕەتی ترە، تا بە راهێنان، رێنوێنیکردن و رێبەرییەکی باش لە بەلارێدا بردنی بەرنامە و پرۆژەکان پێشگیری بکەن.

## کرێکاران:

بێگومان گوشارەکان بۆ بە جیهانی کردن، ژیانی بۆ کرێکارانی هەموو دونیا دژوار کردووە. یەکێتییە کرێکارییەکان بەتوندی لاواز بوونەتەوە، چونکوو لە ولاتە پێشکەوتووەکاندا، خاوەن پیشەسازییەکان لە هەوڵی ئەوەدان کە کەرەستەکانی خۆیان بۆ ولاتانێك راگوازن کە تێچووی هێزی مرۆیی ئەوان هەرزانترە. لە ولاتە لەحاڵی گەشەکاندا(جیهانی سێهەم) دەسەلاتداران زیاتر لەوەی کە هۆگری پاراستنی بارودۆخی کاری باش بۆ کرێکاران، تەنایی ئەوان و مووچەی عاقلانە بۆ کرێکاران بن، هۆگری قازانجی زیاتر و پاراستنی بەرژەوەندیی خۆیانن. دیموکراسی، حکومەتی قانون و ئازادی کۆبوونەوەکان، هەنگاوگەلێکی بەسوودن کە بەکرێکارەکان ئەم هێزە دەبەخشن تا لە بەرانبەر دەسەلاتداراندا لە مافی خۆیان بەرگری بکەن.

بۆ دەستپێکردنی خەباتی جەماوەری، لە سەرەتادا ڕێکخستنی کرێکارەکـان ئەسـتەمە، بـەڵام کاتێك ڕێکخستن بەڕێوە چوو، یەکێتی لە نێوانیاندا بەخێرایی پەرە دەسێنیٚ. تـەنیا بیهێننـەوە بـیر خۆتان کە بزووتنەوەی دیموکراسـیی پۆڵەنـدا هـەنگاوە سـەرەتاییەکانی خـۆی بـۆ سـەرکەوتن، لـە مانگرتنی کرێکارانی کارەبا لە کارگەیەکی کەشتی سازی لە"گیدانسك"ەوە دەسپێکرد.

یەکێك لەو بەشە گرینگانە کـە جێـی سـەرنجی بەرنامـە داڕێـژەرانی خـەباتی ناتوندوتیژییـە، پیشەسازیی ئاڵ وگۆڕ(گواستنەوە)و پیشەسازییە پەیوەندارەکانی پەیوەسـت بەوانەوەیـە. هـەرجۆرە تێکەڵ پێکەڵی و ئاڵۆزییەك لە گواستنەوەی کەلوپەل، مسافیر و خزمەتگوزارییـە جۆراوجۆرەکـان، دەتوانیٚ نرخی ئـابووری و سیاسـی ئـەو کـارە بەسـەر ڕژێمـدا بسـەپێنێت. هاوکـات لەگـەڵ ئـەم مەسەلەیەدا، بەرنامەداڕێژەرانی ستراتیژی بە دەرەنجامەکانی کەمبوونەوەی بەرهەمە جۆراوجۆرەکان و ئەو ماددە خۆراکییانە لە بازاردا بیردەکەنەوە کە دەتـوانیٚ زەبرێکـی گورچـك بـڕ لـە حکومـەت بدات.

## دامەزراوە ئایینییەکان:

بەشێوەیەکی مێژوویی، ڕێکخراوە ئاینییەکان لە شەڕی سیاسی دژ بە حکومەتە سـەرەڕۆکان و بەقازانجی لایەنگرانی چاکسـازی ڕۆڵێکـی زۆر گرینگیـان گێـڕاوە. هەڵبـەت هێنـدیٚ جـاریش بـە پێچەوانەوە لایەنگرییان لە حکومەتە سەرەڕۆکان کردووە. زۆربەی ڕێکخراوە   ئایینییەکان تـۆڕێکی هـەرە بـەربلاۆی مەعنـەوی و ئـابووری لـەنێوان چـینە جیاوازەکـانی کۆمـەڵگا لـە نوخبـەکان و دەوڵەمەندەکان تا چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگا پێك دێـنن و لـەو ڕووەوە  کـە ڕێبـەرانی ئـایینی جگە لە زانستی ئایینی زۆرجار زاڵن بەسەر زانستە کۆمەلاێەتییەکانیشدا، ئێعتبارێکی زۆر باشیان لەنێو خەڵکی ئاسـایی و شـوێنکەوتوانیاندا هەیـە و دەتـوانن بـەربلاۆتر لـە فێرکارییـە ئـایینی و مەزهەبییەکان کاریگەرییان لەسەر دابنێن. ئـەوان دەتـوان بـۆ گرووپـە خـەباتگێڕە سیاسـییەکان، مەعنەوییەتی خەباتگێڕی پێك بێنن، یان تەنانەت خۆیان ببنە بانگەشەکەر و وتەبێژی ئـەوان، یـان لەبەرەی دژبەردا، بەکەڵك وەرگـرتن لـە پێگـەی خۆیـان ببنـە پـارێزەری بەرژەوەنـدیی حکومەتـە سەرکوتگەرەکان. لەهەرحاڵدا ڕێبەرانی خەبات، دەبیٚ کردەوەی خۆیان بەشـێوەیەك ڕێـك بخـەن کـە بتوانن ڕێبەرانی ئایینی بـەقازانجی بزووتنەوەکـە بهێننـە گۆڕەپـانی خەباتـەوە، یـان لـە ئەگـەری پشتیوانییان لە دەسەلاَت، کاریگەری نگەتیڤی ئەوان پووچەڵ کەنەوە.

## ڕێکخراوە جەماوەرییە سەربەخۆکان (ڕێکخراوی جەماوەری یانN.J.O):

هەر ڕێکخراو و دامەزراوەیەك کە لە کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی حکومەتدا نەبێت، بەسەرمایەیەکی پەنگراو بۆ بزووتنەوەی دیموکراسی خوازی دێتە ئەژمار. ئێن.جی.ئۆ نێونەتەوەییەکان دەتوانن بە تەگبیرکردنی خۆیان، یارمەتیی ماڵی بۆ دابینکردنی پێداویستییە ئابوورییەکانی خەبات ڕاکێشن، لەگەڵ کۆمەڵگای نێونەتەوەییدا لە پێوەندیدا بن، زانست و پسپۆڕی پێویست بە ڕاکێشانی هاوکاریی وڵاتانی دیکە بەکار بێنن و بۆچوون و ئەزموونی بزووتنەوە خەباتگێڕییەکانی دیکە بهێننە ناو خەڵکەوە . هەڵبەت ئێن.جی.ئۆکانی ناو خۆی وڵات، لەباری سەرمایە و پانتایی ئەو چالاکییانەی کە ئەنجامی دەدەن سنووردارترن، چونکوو لەژێر چاودێری حکومەتدان، هەرچەند ئێن.جی.ئۆ دەرەکییەکانیش سەرەڕای ئەو هەوڵ و تێکۆشانانە کە بۆ پاراستنی سەربەخۆیی و لەژێر چاودێری ڕاستەوخۆی حکومەت نەبوونیاندا ئەنجامی دەدەن، بەوحاڵەشەوە بەکرێگیراوانی حکومی ڕەخنە دەکەنە ناویانەوە.

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی هێندێ لەو ئێن.جی.ئۆیانە کە بەکۆکردنەوەی ڕایەڵەیەکی خزمەتگوزاری و پێداویستی بۆ خەڵك هەنگاو هەڵدەگرن، ئەمەیە کە نیشان دەدەن کە خەڵك بەردەوام بەحکومەتەوە نەبەستراوەتەوە و خۆیان لێهاتوویی ئەوەیان هەیە کە هێندێ لەکاروبارەکان بەڕێوە بەرن. چالاکیی ئێن.جی.ئۆکان وێڕای سنووردارکردنی هێزی پشت ئەستوور بە حکومەت، زیرەکانە ڕوونکەرەوەی ئەم خاڵەیە کە ئەوە حکومەتەکانن کە بەخزمەتگوزارییەکان و هاوکاریی خەڵك بەستراونەتەوە، نەخەڵك بەحکومەت.

نموونەیەکی بەرچاو لە کاریگەریی ئێن.جی.ئۆکان لە پساندنی بەستراوەیی خەڵك بەدەسەڵاتە سەرەڕۆکان لە وڵاتی بۆرما ڕووی داوە. ماوەیەك دوای بەدەسەڵات گەیشتنی ژەنەڕاڵ نوین لەساڵی١٩٦٢ی زایینی، بەشی ڕۆژئاوای وڵات لەویلایەتی ئاراکان، شایەتحاڵی شەپۆلێکی ڕووخێنەر بوون. بەپێی بەڵگەنامە و ڕاپۆرتەکان، بانگەشەکەرێکی کاتولیکی لەڕێگای پەیامگەلێکی ڕادیۆیی لەگەڵ ناوەندە ئایینییە کاتولیکەکان لە بەشە جیاجیاکانی وڵاتدا و هەروەها لە وڵاتی هێند داوای یارمەتی کرد. ئەم داخوازییە کاردانەوەی خێرا و کاریگەری لێکەوتەوە و شەپۆلێك لە خۆراك، کەرستەی پزیشکی و دەرمانی لە ماوەی چەند ڕۆژدا هاتە ناو وڵاتەوە. کاتێك حکومەت ، گرووپگەلێکی بۆ تاوتوێ کردنی کارناسانە نارده ناوچەکە، ڕوون بووەوە کە هیچ پێویستییەك بە یارمەتییە حکوومییەکان نییە. چونکوو خەڵك بە بەڕێوەبەرێتیی خۆیان قەیرانەکانیان تێپەڕاندبوو. ژنراڵ نوین لەم هەوڵەی خەڵك زۆر تووڕە بوو، چونکوو ئاشکرا

بوو کە خەڵك خۆیان دەتوانن قەیران و کێشەکانیان چارەسەر بکەن. سەرەنجام ژنراڵ نوین قەشە مەسیحییەکانی لە بۆرما دەرکرد.

ئەگەرچی ئێن.جی.ئۆکان پێڕەوی ناوخۆ و ئامانجی سەربەخۆیان هەیە، بەڵام دەبێ ئەم ئامانج و رێچکەگەلە لە چوارچێوەی ئامانجی بزووتنەوەی دیموکراسیخوازانەدا جێ بگرێت و لەگەڵیدا یەکگرنەوە.

لە سەرچاوەکانی دیکەی هێزی دەسەڵات دەتوانین رێکخراوە پیشەییەکان، پارتە سیاسییەکان، بازرگانیی دەرەکیی ولاتانی دیکە و حکومەتەکان _ بەتەنیایی یان لە چوارچێوەی رێکخراوە نێونەتەوەییەکاندا _ ناو ببەین. سەرەڕای ئەمە لە رۆڵی گرووپە بچووکەکانی ناو کۆمەڵگا کە لەپێناو ئامانجێکی تایبەتدا پێك دێن نابێ کەمتەرخەم بین، وەکو یانە وەرزشییەکان، گرووپە کتێب خوێنەکان، گرووپە زمانناسەکان، گرووپەکانی پارێزەری ژینگە و هتد.

رێکخراوەکان، هەڵگری سەرچاوەکانی هێزن و بەستێنی پێکهاتنی چالاکییەکانی کۆمەڵگا دەخوڵقێنن. هەربۆیە دەبێ ستراتیژیی خەباتە ناتوندوتیژییەکان لەسەر بنەمای ناسینی سەرچاوەکانی هێز و راکێشانی هاوکاریی کاریگەری خەڵك دابمەزرێت.

| دەسەڵات | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| هۆکارەکانی دی | فەرمانبەرانی خزمەتگوزارییە جۆراوجۆرەکان | کرێکاران | رێکخراوە مەدەنییەکان | هێزە رێککەرەکان | دەزگا راگەیاندنەکان | لاوەکان |

پاڵپشتەکانی هێزی حکومەت(دەسەڵات)

# بەرفەرمانی (گوێڕایەڵی)

مرۆڤ سەربەست دێتە دونیا

بەڵام بە درێژایی تەمەنی،

لە هەموو شوێنێك لەودیوی میلەکانەوەیە.

ژان ژاك روسۆ

چۆن دەسەڵاتداران بەسەر هاووڵاتیاندا دەسەڵاتی خۆیان دەسەپێنن و چۆن دەیپارێزن؟ چۆن تەنانەت ئەو کاتانەش کە کردەوەی حکومەت لای جەماوەر پەسند نییە، بەڵام بەشێوەی بەربلاو پشتیوانی لێ دەکەن و بڕیارەکانیشی بەڕێوە دەبەن؟

هەوڵەکە بۆ ئەوەیە کە بەدۆزینەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانە هۆی سەرەکی ملکەچکردنی خەڵك بەشێوەی بنەڕەتی تاوتوێ بکەین.

شێوازی پلۆرالیزمی دەسەڵات، سەرچاوەکانی هێزی دەسەڵات و پاڵپشتەکانی و گوێڕایەڵیی خەڵك سێ فاکتەرێکن کە ناسینی ئەوان بۆ تێگەیشتنی تیۆری و کرداری خەباتی ناتوندوتیژیی جەماوەر گرینگن. ناسینی ریشەیی هۆی گوێڕایەڵیی جەماوەر لەم مەسەلە کە بۆچی خەڵك ملکەچی هێندێ لە حکومەتەکان دەبن و یان تەنانەت بۆ ئامانجێك کە خۆیان باوەڕیان پێی نییە یان تەنانەت بەرهەڵستکاریشین، گیانی خۆیان فیدا دەکەن، زۆر گرنگە.

گوێڕایەڵی "دڵ"ی دەسەڵاتی سیاسییە. دەسەڵاتداران بێ بەرفەرمانیی خەڵك ناتوانن درێژە بەدەسەڵاتی خۆیان بدەن. گوێڕایەڵی بەستێنێکە کە خەباتی ناتوندوتیژی لەسەر بنەمای ئەو شکڵ دەگرێت. ئەگەر رێبەرانی خەبات، بۆ لەناو بردنی دەسەڵاتە سەرەڕۆکان و دامەزراندنی دیموکراسی، تێدەکۆشن تا بە دنەدانی جەماوەر ئەوان لەدرێژەدان بەهاوکاری و پەژراندنی دەستووری دەسەڵاتداران رابگرن ، دەبێ سەرەتا تاوتوێی ئەم مەسەلە بکەن کە هۆی سەرەکی گوێڕایەڵیی خەڵك چییە؟

لەدرێژەدا هێندێ لە هۆکارەکانی گوێڕایەڵی شرۆڤە کراون.

## عادەت(خوو):

هۆی ئەوە کە زۆرێك لە خەڵك بوونەتە ملکەچی دەسەڵاتداران تەنیا عادەت بە گوێڕایەڵییە. ئێمە عادەتمان گرتووە بەوە کە ملکەچی خاوەنی دەسەڵاتەکان بین و لە منالییەوە

بەم گوێڕایەڵییە عادەتمان گرتووە . بۆ زۆرێك لە ئێمە بەرفەرمانی لە دەسەڵاتداران، لەباوك و دایك، خوشك و برای گەورەتر، باوەگەورە و دایەگەورە و خزمانیدیکەوە دەست پێدەکات و بەدوای ئەودا لەگەڵ ماموستایانی قوتابخانە، هێزە ئینتیزامییەکان و تەنانەت هێماکانی دەسەڵاتەوە بەردەوام دەبێت.

یەکێك لە هۆکارەکانی خولەکانی راهێنانی سوپا لە سەرەتای دەست بەکار کردنی سەربازەکان، راهێنانی جۆرێکی نوێ لە گوێڕایەڵییە. سەربازی تازەکار فێر دەبێ کە چۆن بێ ئەملاو ئەولا و پرسیار کردنێك، پەیڕەوی بکات لە فەرمانی فەرماندەکانی خۆی. راهێنانە دوور و درێژەکانی ریزبوون[1] و وانە بەردەوامە تێکەڵ بەتەشەر و تۆقاندنەکان هیچ وێکچوونێکیان لەگەڵ شێوازەکانی پێشکەوتووی شەڕدا نییە، بەڵکو تەنیا بۆ پەرەپێدانی گوێڕایەڵی و تەسلیم بوونە. سەرەڕای ئەوە شێوەی ژیانی سەربازی و نیزامی هەروەکو کەڵك وەرگرتن لە چەك، لەسەر بنەمای عادەت و راهێنانە بەردەوامەکانە و بە هیچ جۆرێك پێویستی بە بیرکردنەوە و راوێژ نییە.

باشترین نموونە بۆ مانای عادەت، تووشبوان بەماددە سڕکەرەکانن. ئەوان نازانن تا چ رادەیەك ماددەی سڕکەریان بەکار هێناوە و تەنانەت ئەو کاتەی کە نرخیشی بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر بەرزبۆتەوە، دیسان وازیان لێ نەهێناوە. بۆ تەرك کردنی عادەتەکان، لەوانە عادەت بەگوێڕایەڵی دەبێ، بڕیارێکی جدی بدەین و ئەو بڕیارە بەردەوام وەبیر بێنینەوە و لەبەر خۆمانەوە هۆی تەرککردنی ئەم عادەتە دووپات بکەینەوە . لە راستیدا ملکەچ کردن بۆ یاساکان یەکێك لە پێویستییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتییە، بەڵام لەو شوێنانەدا کە گوێڕایەڵی لە شێوازی عاقڵانە و ئاگایانەی خۆی دوور دەکەوێتەوە و دەبێتە عادەت، ئەوکاتە ئیدی بۆ کۆمەڵگا مەترسیدار دەبێت، چونکوو ئەو خەڵکە کە تووشی عادەت دەبن ئیتر ئەو قانون و دەستوورگەلەش کە بە زیانی خۆشیان تەواو دەبێت، شرۆڤەی ناکەن و وەکو سەربازی سوپا بەڕێوەیان دەبەن. رەنگە یەکێك لەو هۆکارانەی کە زۆرێك لە حکومەتەکان، لە پۆستە جیاجیاکاندا، لە هێزە سەربازییەکان بۆ بەدەستەوە گرتنی کارەکان کەڵك وەردەگرن، هەر ئەمەیە کە دەستوورەکان لە بەرزترین پلەکانەوە تا نزمترین پلەکان، بە بێ هیچ ناڕەزایەتی و رەخنەگرتنێك بەڕێوە دەچێ.

---

(١) Close order drill پرۆڤەی سەف یان راهێنانە نیزامییە رۆژانەکان. و

## ترس لەسزادان:

هۆکارێکی دیکە کە خەڵك پەیڕەوی لە حکومەت دەکەن، ترس لە سزادان و تەمێ کردنە. کاتێك ئێمە یاساکان پێشێل دەکەین، یاسا هێزی خۆی بۆ سزادانی ئێمە بەکار دێنێت. لەوانەیە یاسا، سزای کوشتن، دەستبەسەرداگرتنی داراییەکان یان زینداني لەبەرچاو بگرێ. بەڕێوەبردنی سزادان، بۆ تەمێ کردنی کەسایەتی پێشێل کەری قانون و پێشگیری لە کەسانی دیکە لە ئەنجامدانی کاری هاوشێوەیە. لە کۆمەڵگا پێشکەوتوو و خەڵكسالارەکاندا، تەمێ و سزادانەکان زۆرتر بۆ پشتیوانی لە بەڕێوەبردنی یاسا کۆمەلایەتی و مەدەنییەکانە تا دیسپلینی کۆمەڵگا بپارێزرێت، لە حالێکدا لە حکومەتە سەرەڕۆکاندا، دەسەلاتداران پێویستیان بە هەست بە مەترسی کردنی خەڵك لە سزادانەکان _ بۆمانەوەی حکومەتی خۆیان — هەیە و ئامانجیان لەم کارە پاراستنی دەسەلاتە نەك پاراستنی تەکووزی و دیسپلینی گشتی.

## بەرژەوەندی تایبەتی:

زۆربەی خەڵك نیشان دەدەن کە هۆگرییەکیان بۆ حکومەتی ئێستا نییە و سیاسەتەکانی لە بەرژەوەندیی خۆیاندا نابینن، بەلام هەر ئەم کەسانە لەکردەوەدا چالاکانە پشتیوانی لە حکومەت دەکەن. لێکۆڵینەوە لەسەر بەرژەوەندیی کەسەکیی تاکەکان و ئەو پوانگەلە کە لە بەرانبەر پشتیوانی کردن وگوێڕایەلێیان لە دەسەلات وەری دەگرن، ئەم پارادۆکسە بەشێوازێکی ڕێکوپێك روون دەکاتەوە. بۆنموونە ئەو پوان و پێداویستییە تایبەتانە کە بۆ بەرفەرمانی لەو یاسا نادیموکراتیك و ناخەڵکی و تەنانەت دژی گەلییانە لە زۆرێك لە ولاتە نادیموکراتیکەکاندا بەهێزە نیزامییەکان دەدرێ، هۆکاری پشتیوانیی ئەوان لە دەسەلاتە. پلەپێدان وبەخشینی نیشانە و پلە، پرستێژ و پێداویستیی تایبەتیی خۆشگوزەرانی و مالی لەم پوانگەلەنە. لە سیستمە ئابوورییە سانترالیزە(چڕبۆوە)کاندا کە لە ژێر چاودێری حکومەت دایە و تێکڕای تاکەکان بۆ دابینکردنی پێداویستیی ژیان ناچارن لە خزمەتگوزارییە حکوومییەکاندا دامەزرێن و بەشە ناحکوومییەکان ڕۆڵێکی چالاك و گاریگەریان لە بواری بەرهەمهێنان و ئابووریدا نییە، لە پلەی یەکەمدا تاکەکان ناچارن پیشەی خۆیان بپارێزن، چونکوو بۆ بژێوی ژیانیان بەربژارێکی تریان نییە. لەم حکومەتانەدا هێندێ لە تاکەکان بەهۆی لایەنگری

لەدەسەلآت بە کەرستە و پێداویستییەکی بەرچاو دەگەن. هەڵبــەت نــاتوانین هەرکەســێك کــە بەهۆی هۆکاری بەرژەوەندیی نەخوازانەوە ملکەچــی دەســەلآتە مــەحکووم بکــەین، چــونکوو لەوانەیە ئەو تاکە بەڵگەی خۆی هەبێت، هۆکار گەرلێك وەك" رێگاچارەیەکی دیکــە نییــە"، یان " ئێستا با شترین بەربژار هەرئەم دەسەلآتەیە"و هتد. بەلآم کێشەی سەرەکی بۆ خــەباتی ناتوندوتیژیی جەماوەری ئەمەیە کە سەرنج بدەینە هــۆی بەرفــەرمانی تاکــەکان کــە زۆرجــار لەسەر بنەمای بەرژەوەندیی تاکەکەسییە.

## "بەڵێن"ی ئەخلاقی:

بەڵێنی ئەخلاقی بۆ گوێڕایەڵی لە هەموو کۆمەڵگاکاندا هەیە. ئەم بەڵێنە کە دەبێتە هۆی گوێڕایەڵیی ریشەیی لەم باوەڕەدایە کە قــازانج(خێــر)ی گشــتی گــرینگترین مەســەلەیە. ئــەم مەسەلە باس هەڵگرە، چونکوو زۆربەی یاساکان پشتیوانی لــە هاوولآتیــان دەکــەن، زۆربــەیان خەڵك لە بەرانبەر تــاوان و خراپەکاریگــەلێك وەك دزی، قــەتڵ و دەســت درێژیــدا دەپــارێزن، هێندێکی دیکە زامنی بەرژەوەندیی گشتیی کۆمەڵگا وەکو بەمانگانە دابەشکردنی کالآکان و خزمەتگوزارییەکان، هەناردنی پیاوانی گەنج بۆ سەربازی، وەرگرتنی بــاج و تــاد.... ، بــەلآم لەوانەیە زۆربەشیان بە پێچەوانەی بەرژەوەندیی گشتیی کۆمەڵگا بن.

زۆربەی ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەین کە بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی گشتی باشترین هەڵوێســت ملکەچ کردن بۆ دەسەلآتی هەنووکەییە، چونکوو هیچ بەربــژارێکی دیکــە بــەدی ناکرێــت تــا ژیانی ئێمە باشتر و بارودۆخەکە چاکتر بکات. بێگومان ژوزێف ستالین جینایەت کارێك بــوو. بەلآم ملیۆنان کەس پێڕەوییان لێ دەکرد، چونکوو لەسەر ئەم باوەڕە بــوون کــە خێــری ولآت و بەرژەوەندیی گشتی، لە پێڕەوی کردن لەودایە. سەرەڕای ئەوەی کە ئێستا روون بووەتــەوە کــە ئەو هۆکاری کوشتنی ٢٠ ملیۆن مرۆڤ بووە، هێشــتا هێنــدێ لــە خــەڵکی روســیا وەك رۆژە خۆشەکانی رابردوو لەسەردەمی ئەو دەڕوانن.

## ئەو فاکتەرانەی لەسەرەوەی مرۆڤایەتییەوەن:

لە هێندێ لەکۆمەڵگاکاندا دەسەلآتداران لایەنێکی خــوایی و ئەوپــەڕ مرۆیــی بــە خۆیــان دەدەن. کاتێك دەسەلآتدار یان حاکمێك وەکو خاوەنی بێ ئــەملاولای دەســەلآت یــان نوێنــەری ئایین دەناسێنن، گوێنەدانە ئەو زۆر ئاستەم دەبێت. کێ دەی وێــرا ملکەچــی ئــادۆڵف هیتلێــر

نەبێت کە لەوپەڕی دەسەڵاتیدا، خۆی وەك نوێنەری خوا بۆ رزگاریی وڵات و گەلەکەی دەناساند؟ ئەم فێڵی دەسەڵاتدارانە بۆ بەخشینی شێوەیەکی ئیلاهی بە خۆیان، مێژوویەکی کۆنی هەیە. بە درێژایی مێژوو خەڵك ناچار بە گوێڕایەڵی لە دەسەڵاتدارانێك بوونە کە خۆیان بە پاشا_خوا، سێبەری خوا یان جێگری ئەو ناساندووە. تەنیا رێگای سەرکەوتن بەسەر ئەم فێڵ و تەڵەکانەدا، روونکردنەوەی بیروڕای گشتییە کە چیتر هیچ دەسەڵاتدار یان تاکێك نابێ لافی جێنشینی خوا لەسەر زەوی لێ بدات، تا لە رێگای بانگەشەی بێبناغەوە دەسەڵاتی خۆی رەها و شیاو پیشان بدات.

## کەسایەتی ناسیی دەروونی لە چوارچێوەی پشتیوانی لە دەسەڵاتداران:

هێندێ لە خەڵك وەکو زنجیرەی بنەماڵەیی و خزمایەتی دەسەڵاتداران دەبینن. هەرواکە لە نموونەیەکی چووکەتردا، لایەنگرانی یانەی تۆپی پێ لە شار یان گەڕەکێکی گچکەتردا، لە سەرکەوتنی تیپەکەیان خۆشحاڵ دەبن یان بە دۆڕاندنی خەمبار دەبن، هێندێ لە خەڵکیش بەدروستکردنی جۆرێك نزیکی دەروونی و هەستی پشتیوانیی نەتەوەخوازانە لە دەسەڵاتداران پێڕەوی دەکەن. ئەم هەستە کاتێك بەهێزتر دەبێت کە خەڵك و دەسەڵاتداران لە رەوتی خەباتدا، وەکو خەبات بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی، شانبەشانی یەکتر خەباتیان کردبێت. ئەم فاکتەرە دەبێتە هۆی ئەوەی ئیدی خەڵك چاوی خۆیان لە ئاست کردەوەکانی دەسەڵاتداران ببەستن و تەنیا بە هەستێکی سەرەتایی نەتەوەخوازیی و هەست کردن بە شوناسی عەشیرەتی پشتیوانییان لێ بکەن. لە زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێهەمدا کە دەسەڵاتداران ئاگاداری ئەم کارەن، بە هەلژرنگان(تەحریك)ی سیمبولە عەشیرەییەکان کە بە رواڵەت بۆ خەڵك و دەسەڵاتداران شێوەیەك لە شوناسی نەتەوەیی دروست دەکەن، دەست دەدەنە راکێشانی پشتیوانی خەڵکەوە.

## هەڵچوون و بێ مەیلی:

زۆربەی خەڵك ئاشکرای دەکەن کە سەبارەت بە زۆرێك(ئەگەر نەڵێین هەموو) لە یاساکان، کە بەهیچ جۆرێك چاوەڕوان ناکرێ کاریگەریی نیگەتیڤ لەسەر رەوتی ژیانی رۆژانەیان دابنێت، هیچ هۆگری و هەستێکیان نییە. بەو واتایەی کە ئەوان لەبێ مەیلییەکی کامڵ سەبارەت بە یاساکان و کاروباری سیاسیدا بەسەر دەبەن. ئەگەر ستەمکارانەترین و

نامرۆڤانەترین یاساکانیش سەروەر بێ، تا ئەوکاتەی کە ئەم یاساگەلە ئـەوان نەگرێتــەوە و تـا کاریگەری لەسەر رەوتی ژیانی رۆژانەیان دانەنێت، لەبیرکردنەوە لە ئاکامەکەی خۆ دەپـارێزن. تەنانەت ئەگەر ئەم یاساگەلە ببنە هۆی لەناوچوونی مافی نـەوەکانی داهـاتوو یـان منـدالآنی ئەوان. هۆی ئەمەیە کە زۆربەی خەڵك روانگە و ئاسۆیەکی زەینی بـەرفراوانتریان لـە بازنـەی بەستراوی رۆژانەی خۆیان نییە و تێگەیشتنی ئـەوان لـە ژیـان، تـەنیا بـەرێوەبردنی چـالاکی رۆژانەیە. ئەوان بۆیە لە قانون پێرەوی دەکەن چونکوو وابیردەکەنەوە کە خراپتر لە"خراپ"یش هەیە و بۆ پێشگیری لە بارودۆخی خراپتر، لەگەڵ خراپی هەنووکەدا هەڵ دەکەن. وەها خەڵکێك تەنیا کاتێك بۆ نارەزایەتی و دژایەتیی رادەپەرن کە قـانون بـە چوارچـێوەی ژیـانی رۆژانـە و خۆشی و ئازادییە کەسێتییەکانی ئەوان زیان بگەیەنێت. ئەرکی خەباتگێران بـۆ بـەدیهێنانی دیموکراسی ئەمەیە کە خەڵك سەبارەت بەم راستییە ئاگادار کەنـەوە کـە تـەنیا بەرژەوەنـدیی تایبەتی و تاکی ئەوان گرنگی نییە و وەبیریان بێننەوە کە بێمەیلی و ناچـالاك بـوونی ئـەوان سەبارەت بە چارەنووسی کۆمەڵگا، بەربوار(پێش زەمینـە)ی بلاوبوونـەوەی سـەرەرۆیی و بـە کۆیلە کردنی هەموانە. بنیاتنانی سنوورێکی گشتیی رەنگە لـە بـارودۆخی ئێسـتادا لەسـەر هێندێ لایەنی ژیانی تایبەتی ئەوان کاریگەری نەبێت، بەلآم بوار بۆ دەست درێژی بەمافی تاك بەتاکی ئەندامانی کۆمەڵگا دەرەخسێنێت.

### نەبوونی برِوا بەخۆبوون:

لەبەر زۆر هۆکار، زۆربەی خەڵك تووشی نەبوونی برِوا بەخۆبوونن. نەبوونی برِوا بەخۆبوون، دەبێتە هۆی خۆ بەکەم زانین، نەبوونی باوەرِ بە هەڵسەنگاندن و تواناییـەکان و نافـەرمانی لـە دەستووره سەرەرۆیانەکان. لە کۆمەڵگایەکدا کە چەندین دەیەی بەردەوام شایەتحاڵی سەرەرۆیی و پاوانخوازیی بووە، ئامادەیی و ئەزموونێکی کەم لەوکۆمـەڵگادا بـۆ بەشـداری و بریـاردانی بەکۆمەڵ هەیە. لەوەها کۆمەڵگایەکـدا دەرفەتگـەلێکی کـەم بـۆ پەرەپێـدانی رێبەرایـەتی و رێنمایی کردن دێتەپێشەوە و زۆربەی خـەڵك وابیردەکەنـەوە کـە حکومـەتی ئـەوان باشـترین بەربژارە بۆ بەرێوەبەریی کۆمەڵگا.

ئەم نەبوونی باوەرِ بەخۆبوونە، خەباتگێرانیش دەخاتە ژێر کارتێکەریی خۆیەوە، بەو جۆرەی کە ئەوان گومان دەکەن ناتوانن لە بەرانبەر دەسەلاتدا پارێزگاری لـە خۆیـان بکـەن، یـان لـە رێگای گەیشتن بە ئازادیـدا سـەرکەوتوو بـن. گەرانـەوەی بـاوەرِ بـەخۆبوون بـۆ کۆمـەڵگا و

بەهێزکردنی کەسایەتیی تاکەکان، یەکێك لەپێش مەرجەکانی خەباتی ناتوندوتیژیی جەماوەرییە، بەجۆرێك کە بتوانن داوەرییەکی دروستیان لەسەر دەسەڵاتداران هەبێت و دوای گەیشتن بە ژیری و روانگەیەکی باش، لەسەر بزووتنەوەی خەباتگێڕی و ئامانجەکانیشی هەڵسەنگاندنی باش بکەن.

لە زۆربەی کاتەکاندا ئەو هەستەی کە ئێمە بە وشەگەلێکی وەك بێ مەیلی و حەزنەکردن بە چالاکییە سیاسییەکان و سەرنجدان بە بارودۆخی کۆمەڵگا پاساوی بۆ دێنینەوە، لە راستیدا هەر ئەو هەستی باوەڕ بە خۆنەبوونەیە.

## رێوشوێنە گونجاوەکان(میکانیزم) و شێوازەکانی خەباتی ناتوندوتیژی:

تێپەڕبوونی کۆمەڵگاکان لە سەرەڕۆییەوە بۆ دیموکراسی، بێجگەلە رێکار و میتۆدێك کە بۆ گۆڕینی پێکهاتە و گەیشتن بە دیموکراسی هەڵدەبژێردرێت، پرۆسەیەکی دژوار و تاقەت پرووکێنیشە.

بەوجۆرەی کە خەڵك شێوەی خەباتی ناتوندوتیژی بۆ بەرەنگاربوونەوە لە بەرانبەر دەسەلاتدا هەڵدەبژێرن، دەبێ میکانیزم و شێوازگەلێك بناسن کە بە هاتنەدی ئامانجە دیاری کراوەکان و دروستکردنی هاوسەنگی لە نێوان دەسەلاتداران و خەڵکدا یارمەتی دەگەیەنن. دکتۆر جین شارپ،[1] چوار جۆر میکانیزم بۆ خەباتە ناتوندوتیژییە جەماوەرییەکان دەستنیشان دەکات. ئەم چوار میکانیزمە بریتین لە گۆڕینی روانگە،[2] قبوولکردن،[3] ناچارکردنی(ناتوندوتیژی)[4] و هەڵوەشانەوە.[5] ئەم میکانیزمگەلە چوارچێوەیەکی تیۆری و پێکهاتەیی بۆ کۆکردنەوە و تاوتوێ کردنی زانیارییەکان، لە رێگای ناسینی پێوەندیی هێز لە نێوان خەڵك و دەسەلاتدا پیشان دەدەن.

---

(١) ئەم بەشە لەلایەن (رابێرت هێلوی)یەوە نووسراوە ـــ و

(2) Conversion
(3) Accomodation
(4) Coercion
(5) Disintegration

لەم بەشەدا سەرەڕای ئەم میکانیزمانە، شێوازگەلی نارەزایەتی دەربڕین و دژایەتی کردنی ناتوندوتیژیش نیشان دەدرێت کە بریتین لە نارەزایەتی،[٦] دنەدان،[٧] خۆبواردن لەهاوکاری و[٨] دەست تێوەردان.[١] ئەم شێوازانە بۆ دروستکردنی چاکسازی و ئالوگۆڕی بنەڕەتی لە پێکهاتەی هێزی دەسەلاتدا زۆر بەسوودن و کاریگەرییەکی بەرچاویان هەیە. هەروەها بە بەکارهێنانی ئەوانە، دەتوانین شێواز و بەرنامەکانی خەباتی ناتوندوتیژیی رابردوویش تاوتوێ بکەین و جیاوازی ئەوان لەگەڵ شێوازە رێکوپێکەکاندا بە روونی ببینین.

بۆ دروستکردنی بەستێنی چاکسازیی سیاسی و کۆمەلایەتی لە کۆمەڵگادا، دەبێ بیرۆکەی خەباتی ناتوندوتیژیی جەماوەری، لە شێوازی تیۆرییەوە بۆ شێوازی کردەیی بگۆڕدرێت. لە پرۆسەی گۆڕینی تیۆری بە کردەیی، گرینگ ئەمەیە کە لە جۆری هەڵسوکەوتی دەسەلات لە دژکردەوە بەرانبەر بە نارەزایەتیی جەماوەری وێنەیەکی دروستمان هەبێت، ئەم وێنەیە یارمەتیی خەڵك دەدا تا بتوانن بەدروستی دژکردەوە لە خۆیان پیشان بدەن و کاریگەری لەسەر کردار و ئاکاری دەسەلاتداران دابنێن. ئەم ناسینە، لەسەر هەڵبژاردنی شێوازی خەباتی ناتوندوتیژی بۆ دەستەبەربوونی خواستەکان و ئالوگۆڕ لە کۆمەڵگادا و لە کۆتاییشدا پێکهێنانی هاوسەنگی لە پێوەندیی هێز لە نێوان دەسەلاتداران و خەڵکدا کاریگەری زۆری هەیە.

لە درێژەدا بۆ روون بوونەوەی ئەم باسە، میکانیزمە جۆراوجۆرەکان تاوتوێ دەکەین:

١- گۆڕینی روانگە.

٢- قبوولکردن.

٣- ناچارکردن.

٤- هەڵوەشانەوە (رووخان).

### ١- گۆڕینی روانگە:

ئەو میکانیزم و پرۆسانەی کە بۆ بەرێوەبردنی هێندێ چاکسازی لە بەرانبەر دەسەلاتدا بەکاردێن، دەرخەری خواست و بیر و ئاکامی شێوازەکانی ناتوندوتیژییە لە پرۆسە

---

(6) Protest٦
(7) Persuasion
(8) Non-cooperation
(1) Intervention

جیاجیاکانی خەباتدا (بەم مانا کە میکانیزمی خەبات، چوارچێوەی سەرەکی و قاڵبێکە کە شێوازەکانی خەبات لەناو ئەودا جێ دەگرێ).

لەوانەیە لە هێندێ بابەتدا رژێم بەم ئاکامە بگات کە قبووڵ کردنی هێندێ لە پێداویستی و خواستەکانی گرووپە جەماوەرییەکان، لەگەڵ بەرژەوەندیی دەسەلاتدا دژایەتی نییە. لە هێندێ بابەتدا گۆڕینی روانگەی دەسەلاتداران، ئاکامێکی روون و درەوشاوەی بۆ خەڵك بەدواوە بووە. هەروەها رازی بوونی دەسەلاتداران بە دانی هێندێ پوان، دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی پرستیژ و ئیعتیباری یاسایی بۆ گرووپە خەباتگێڕەکان، کە ئەم کارە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی هەڕەشە و گوڕەشە و ئەو مەترسییە دیار و هەست پێکراوانەی کە زۆرجار رووی لە گرووپە سیاسییەکانە و لە گشتی گرنگتر، هێزە خەباتگێڕەکان بۆ رۆژە هەستیار و قەیراناوییەکان[1] دەپارێزێ. بەلام سەرنجدان بەم خاڵە گرنگە کە ئەم شێوازە بەهۆی بەکارهێنانی گوشار لەچینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگا، بەگشتی بۆ خەبات دژی رژێمە ملهۆڕ و سەرەڕۆکان کارامەیی لە سەداسەدی نییە. بەلام بەم حاڵەشەوە لە هێندێ بابەتدا کەڵك وەرگرتنی دروست لەم میتۆدە و چوونەسەرەوەی لە کاتی خەبات لە بەرانبەر هێندێ رژێمی ستەمکاردا کارتێکەری بووە.

یەکێك لە نموونەکانی بەکارهێنانی ئەم شێوازە لە بەرانبەر رژێمە سەرەڕۆکاندا، بەرنگاریی خەڵك لە بەرانبەر رژێمی سەرەڕۆی نیزامیی بۆرما لە چوارچێوەی خوێندنی زمانی ئینگلیزی لە قوتابخانە بنەڕەتییەکانی ئەو ولاتەدا بوو. دوای ئەوەی کە لەساڵی ١٩٦٢ی زایینی. نیزامییەکان لەولاتی برمەدا دەسەلاتیان بەدەستەوە گرت، ژنەراڵ نەوین رایگەیاند کە زمانی ئینگلیزی چونکوو وەبیرهێنەرەوەی دەوڵەتی داگیرکەری بەریتانیایە، نابێ لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا بوترێتەوە. لەو سەردەمەدا زمانی ئینگلیزی وەکو زمانی دووەمی خەڵکی بۆرما لە قەڵەم دەدرا و زۆربەی خەڵك بەباشی ئەم زمانەیان دەزانی. هۆی سەرەکی بڕیاری حکومەتی نیزامی ئەمە بوو کە خەڵك لە پێوەندی و دەست گەیشتن بە سەرچاوە هەواڵنێرییە نێونەتەوەییەکان دوورخاتەوە ، چونکوو زیاتر بە زمانی ئینگلیزی بوون. لە راستیدا رژێم دەیەویست لە پشت دەمامکی دژایەتی لەگەڵ کۆلۆنیالیزمدا، جۆرێك سانسۆڕی زانیاری دروست بکات. تەنانەت سنووردارکردنی زمانی ئینگلیزی زانکۆکانیشی گرتەوە. دوای تێپەڕینی زیاتر لەدوو دەیە، ئەم

---

(١) مەبەستی نووسەر ئەمەیە کە ئەم شێوازە بەهۆی جەوهەری دیسکۆرس(گوتار)ی و خۆبواردنە لەشێوازەکانی رووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆ لەگەڵ دەسەڵاتدا، تێچووی کەمتری هەیە. و

بابەتە بە دەسـەلاّتداران سـەلمێنرا کـە سـنووردانان و سانسـۆڕ، هێنـدێ دەرەنجـامی نیگـەتیڤی ئابووریی بەدوای خۆیدا دێنێت، سەرمایەگوزارە بیانییەکان لەو کارخانەگەلەدا کە فەرمانبەران و بەڕێوەبـەرانی ناوەنـدی، توانـای دروسـتکردنی پێوەنـدی بـە زمـانی نێودەوڵـەتیی بازرگـانی و پیشەسازییان نەبوو، هیچ مەیلێکیان بۆ سەرمایەگوزاری لـە خۆیـان نیشـان نـەدەدا. هـەروەها خوێنـدکارەکانیش لـە دەسـت گەیشـتن بەهـەلی خوێنـدن لـە زانکۆکـانی دەرەوەدا بـەجێمان. دەرچـووەکانی زانکـۆ پزیشـکییەکانی شـاری رەنگـوون،[٢] بـۆ بەدەسـتهێنانی کـار لـە ولاّتـە دەرەکییەکاندا هیچ شانسێکیان نەبوو و نەیاندەتوانی لە خولـە فێرکارییـە نێـو دەوڵەتییەکانـدا بەشداری بکەن. بە پەرەگرتنی پێویستیی نووسـینگە توجـاری و پیشـەییەکان و چـالاکییەکانی خەڵك بۆ دەست گەیشتن بە دیموکراسی، رژێمیش بەم ئاکامە گەیشت کە بە قبووڵکردنی خواسـتی جەماوەر بۆ راهێنانی زمانی ئینگلیزی، خۆیشی بەهێندێ بەرژەوەندی دەگات.

بـە وەبیرهێنانـەوەی ئـەوەی کـە ئامـانجی سـتراتیژیی بەرنامـەی خـەباتی ناتوندوتیـژی، لاوازکردنی سەرچاوەکانی دەسەلاّتی حکومەتە، شێوازی گـۆڕینی روانگـە (بـێ بـەڕیوەبردنی توندوتیژی) دەتوانێ لە پرۆسەی لاوازکردندا کاریگـەر بێـت. یەکـەم هـەنگاو لـەم پێنـاوەدا ئەمەیە کە، ئەندامانی رێکخراوەکان و ئەو ناوەندانەی کـە خـەڵك لـەدژیان هـەنگاو دەنـێن، تێبگەن کە بزووتنەوەی خەباتگێڕی، وەکو دوژمن سەیریان ناکـات و وێـڕای پێشـوازی کـردن وئەمەگناسی بۆ هاوکارییان، وەکو تاك و رێکخراوێکی شوێن دانـەر بـۆ دەسـت گەیشـتن بـە کۆمەڵگایەکی دیموکراتیك چاویان لێ دەکات. ئەگەر ئـەم بابەتـە دەسـتەبەر بێـت، تاکـەکان هاوکاریی کاریگەرتر و کارامەتریان دەبێت و سەبارەت بە قبووڵکردنی ئەم بابەتە کە ئامانجی خەبات، بەڕێوەبردنی هێندێ چاکسازیی سیاسی و ئامانجە مرۆییەکانە، ئامادەتر دەبن.

سیاسەتی گۆڕینی روانگە، یەکەم میکانیزمە بۆ بەهێزکردن و بلاّوکردنەوەی شـێوازەکانی خەبات لە رێی ئامانجە دیموکراسییەکاندا. زۆر گرینگە کە بۆ ئەم کارە لەو جۆرە پرۆپاگەندانـە کەڵك وەرگرین کـە بـارودۆخی ژیـان لـە سیسـتمە دیمـوکرات و سـەرەڕۆکاندا پێکـەوە هـەڵ دەسەنگێنن و بیر و هزری خەڵك لەسەر پوانە کردەییـەکانی دیموکراسـی و چـۆنیەتی خـەباتی ناتوندوتیژیی جەماوەری لە جیهاندا روون دەکەنەوە. گەیاندنی هەواڵ لەسـەر مانگرتنـەکان، گەمارۆکان، خۆپیشاندانەکان و خەباتی جەماوەری لەناوەوە و دەرەوەی ولاّت لەسـەر گـۆڕینی

---

(٢) Rangoon (پێتەختی برمە) .

روانگەی جەماوەر زۆر کاریگەری دەبێ و لە هەمووی گرینگتر، کێشانی وێنەیەکە لە داهاتوو و ئەوەی کە ژیان لە حکومەتە دیموکراتیکەکاندا چۆنە و شێوازی پێوانی ئەم ڕێگا چۆن دەبێت.

ڕەنگە بەهێزترین شێوازی بەکارهێنانی گوشار لەسەر ڕژێمە سەرەڕۆکان، پیشاندانی نەترسیی و وورەبەرزیی بەرهەڵستکاران بێت. نیشاندانی نەترسیی، ئەم بیرە کلێشەییە لەناو دەبات کە داکۆکیکارانی خەباتی ناتوندوتیژی، کەسانێکی ترسنۆکن. هەروا کە[1] بێ باکیی سەربازەکان لەبەرەکانی شەڕدا بەرز دەنرخێندرێت، قارەمانێتیی ئەو کەسانەی کە بە شێوازەکانی بێ توندوتیژی بەرەنگاری حکومەتە سەرەڕۆکانیش دەبنەوە، جێگای ڕێزلێنانە. لە هێندێ بابەتدا، ئەو ئازارانەی کە خەباتگێڕان لەم پێناوەدا دەیچێژن، بۆ کاریگەری دانان لەسەر خەڵکانی دیکە و هێزەکانی سەر بەدەسەڵات، هۆکارێکی کاریگەرە. ناتوانین بوێری لەگەڵ فاکتەرە نەرێتییەکانیدا هەڵسەنگێنین کە هەر ئەو خوێن ڕشتن و برینداربوونەیە. قبوولکردنی ئەنجامدانی کارێك بەتێکڕا ئەو دەرەنجامانەوە کە هەیەتی، پێوەری هەڵسەنگاندنی بوێرییە. وەك نموونە، ئەوانەی کە ڕاگەیەندراوی سەربەخۆیی ئەمریکایان لەساڵی١٧٧٦ی زایینیدا واژۆ کرد هەڵوێستێکی بوێرانەیان لە بەرانبەر پاشای بەریتانیادا گرت و لە ڕاستیدا بەو شێوە لەو خەباتە مەدەنییانەی کە لە دەیەکانی١٩٥٠و ١٩٦٠ی زایینیدا بە شێوەی مانگرتنی جەماوەری بەڕێوە دەچوو، بەشێوازی مەدەنییانە، پاوشای بەریتانیایان بۆ خەبات بانگهێشت کرد. لە ئەنجامدا بوو بەهۆی یەکگرتوویی هەموو ئەمریکا.

میتۆدی خەباتەکان، خەڵك بۆ بیرکردنەوە هان دەدا تا بەبینینی ئەو خەباتگێڕانە کە ئامادەن بۆ گەیشتن بە ئامانجە بالاکان گیانی خۆیان بخەنە مەترسییەوە، لە ناوەرۆکی ڕاستەقینە و مرۆیی خەبات تێبگەن.

گۆڕانی روانگەی دەسەڵات بۆ بەڕێوەبردنی هێندێ چاکسازیی بە کورتی دەتوانین بەم جۆرە پێناسە بکەین:

" ریفۆرم و گۆڕینی روانگەکانی دەسەڵات دوابەدوای خەباتی ناتوندوتیژیدا، بە جۆرێك کە ئەوان بگەنە ئەو باوەڕە کە جێبەجێکردنی ئامانج و خواستەکانی جەماوەر کارێکی باشە. ئەمە یەکێك لەو چوار میکانیزمی گۆڕانەیە لە شێوازەکانی خەباتی ناتوندوتیژیدا."

---

(١) خاڵی گرینگ ئەمەیە کە خەڵك دەبێ بەمە باوەڕیان ببێ کە ڕەچاوکردنی خەباتی ناتوندوتیژی بەهۆی لاوازیو نەبوونی هێزی بەڕێوەبردنی توندوتیژی نییە، بەڵکوو بەهۆی کاریگەریی ئەم شێوازەو پێشگیری لە توندوتیژیخوازیی لەداهاتوودایە. و

**٢- قبوولّكردن:**

بە گشتی دەتوانین بەكورتی قبوولّكردن بەم شێوەیە پێناسە بكەین:

" سیاسەتی قبــوولّكردن یــەكێك لــە میكانیزمــەكانی چاكســازی و گـۆڕان لــە خــەباتی ناتوندوتیژیدایە كە تیایدا دەسەلاّت لە حالّێكدا لە حالّی رووخان و لاوازیی لە رادەبەدەردایــە، هێشتا هەر شانسی ئەم هەلّبژاردنەی هەیــە تــا بــەدانی هێنــدیٚ پــوان بــە خــەلّك و گرووپــە خەباتگێڕەكان بە قبوولّكردنی خواستەكانیان رازی بێت و بەم جۆرە پێش لــە رووخــانی خــۆی بگرێت."

ئەو كاتەی كە قبوولّكردنی خواستەكانی جەماوەر جیٚ بەجیٚ دەبیٚ، روانگەكانی دەســەلاّت بەتەواوی نەگۆڕاوە و هەموو هەل و مەرجە نوێكانی بە خەباتی ناتوندوتیژی قبوولّ نــەكردووە، بەلّكو گەیشتووەتە ئەم ئاكامە كە پێدانی هێندیٚ پوان و رێكــەوتنی بــیٚ توندوتیژانــە لەگــەلّ بەرهەلّســتكاران بەبــەراورد لەگــەلّ ئــەو ســەركوتكارییانەی كــە رەوتــی خەباتەكــە ســەختتر دەكاتەوە، یان كۆلّدان و بەجێهێشتنی دەسەلاّت، دلّخوازتر و باشترە.

ئەو هۆكارانەی كە دەبنــە هــۆی قبــوولّكردنی خواســتەكان ئەگــەربێت و قبــوولّ نــەكریٚ، لەوانەیە ببێتە هۆكارێك بۆ گۆڕین، ناچاركردن(ناتوندوتیژی) یان هەلّوەشــانەوەی سیســتم یــان رژێم.

لە هێندیٚ بابەتدا كە دەسەلاّتداران، بــە قبــوولّكردنی مەرجــەكانی خــەلّك و ئەنجامــدانی چاكسازی رازی دەبن، بەهۆی باوەڕ بــە لایەنــە ئــەرێنی و خەلّكییــەكانی ئــەم چاكســازییە و لەبەرچاو گرتنی ئینسافەوە نییە، بەلّكو ئامانجی ســەرەكیی ئــەوان _ پێشــگیری لــە گرژییــە كۆمەلاّیەتییەكان، پێشگیری لە بەرەنگاربوونەوەی ولاّتانی دیكە و كۆمــەلّگای نێونەتــەوەیی، لەژێر كاریگەری دانانی هاوولاّتییان بەم پاساوە كە حكومــەت گرینگــی دەدا بەخواســتەكانی ئەوان، كۆتایی هێنانە بە دوژمنایەتیی پێش لەوەی كە دوژمنان سوودی لێوەرگرن _ .

لە هەل و مەرجێكدا كە رژێم بەهۆی گوشاری خەلّكەوە، ناچــار دەبــیٚ هێنــدیٚ چاكســازی بكات، لە روالّەتدا وا نیشان دەدا كە ئەم چاكسازیگەلە دژایەتی لەگەلّ رێبازی گشــتی ئــەودا نییە و بەهیچ كلۆجێك نەبووەتە هۆی لاوازیی دەسەلاّتی ئەو. لە حالّێكدا راستییەكەی ئەوەیە كــە هێــزی پــاوانكراوی ئــەو تووشــی ململانــیٚ بۆتــەوە و لــە هۆشــیار بوونــەوەی هەســتی دادپەروەریخوازانەی جەماوەر ترس و خــۆفی لــیٚ نیشــتووە. ئەمڕۆكــە هێنــدیٚ لــە راگەیاندنــە گشتییەكانی جیهان جاروبار لە هێنــدیٚ پاشەكشــەكانی حكومەتــە ســەرەڕۆكان لــە بەرانبــەر

داخوازییەکانی خەڵکدا بیرورِای گشتی ئاگادار دەکەنەوە. هێندێ جار رژێمی سەرەرۆی بۆرما و دەسەلاَتدارانی سەرەرۆی چین، کاتێك کە بەرپرسانی بالاَی نێونەتەوەیی بۆ سەردان دێنە ئەو ولاَتانەوە، بۆ نیشاندانی مەیلی خۆیان بۆ هێندێ چاکسازیی سیاسی، چەند زیندانییەکی سیاسی ئازاد دەکەن، یان لە هێندێ کاتدا، رژێمی ئیسراییل، بۆ رزگار بوون لە گوشاری نێونەتەوەیی و رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، پۆزی مرۆڤ دۆستی و ئاشتیخواز لێ دەدات. لە راستیدا دەسەلاَتداران لە بەرِێوەبردنی ئەم چاکسازیگەلە خۆشحاڵ نین و هەموو هەوڵێکیان بۆ پاراستنی ئۆتۆریتریانیزم(توتالیتاریزم)و پێشگرتن لە هەر جۆرە زیانێك لە دەسەلاَتەکەیانە. بە وتەیەکی دیکە، ئەوان ئەم جۆرە چاکسازی و پاشەکشەکردنانە بە لەبەر چاو گرتنی هەموو لایەنەکان، بە وردبینی کامڵ و کەمترین مەترسییەوە بەرِێوە دەبەن.

خاڵی گرنگ لە دارِشتنی بەرنامەکانی چاکسازی بە شێوازی گۆرِینی روانگە و قبووڵکردن، ئەوەیە کە بەرپرسانی دەوڵەتی و خەڵك، ئاگاداری ئەم خاڵە ببنەوە کە لە ئەگەری بەجێگەیاندنی چاکسازیدا:

یەکەم _ ئابروویەکی باش لە کۆمەڵگادا بۆ بەرپرسانی دەوڵەتی بەدی دێت ( بەم شێوە دەکرێ ئەوان هان بدەی کە چاکسازی بکەن.)

دووە ەم _ کردەیی بوونەوەی چاکسازی نیشانەی هێز و سەرکەوتنی جەماوەرە .[1]

سێهەم _ ئەمە کە ئەم چاکسازی و گۆرِانە بە بێ پێویستی بەخوێن رشتن و کوشتن بەرهەم دێت.

ئاکامی گشتی خەباتی ناتوندوتیژی بە میکانیزمی گۆرِینی روانگە و قبووڵکردنی چاکسازی ئەمەیە کە بزووتنەوەی جەماوەری بەهێز دەبێت و خەڵك بۆ دەستگەیشتن بە سەرکەوتنی مەزن تر و باشتر ئامادە دەبن.

نموونەگەلێکی دیکە لەو چاکسازییانەی کە لەم دواییانەدا هێندێ لە دەسەلاَتداران رازی بوونە بەرِێوەی ببەن، پانتاییەك لە پۆزلێدانی سیمبولێە تا بەرِێوەچوونی هەڵبژاردنی ئازاد. بۆنموونە لەولاَتی لیتوانی دا، دەسەلاَت بەدەستانی سەرەوەی حکومەت لە بەرانبەر نارِەزایەتیی بەربلاَوی جەماوەریی دژ بە دەسەلاَتی کۆمۆنیستی، بۆ پێشگرتن لە گرژیی سیاسی، دەستیان دایە هێندێ چاکسازیی دیموکراتیك وەك بە فەرمی ناسینی زمانی لیتوانیایی و ئیزنی هەڵدانی

(١) کردەیی بوونەوەی بابەتی یەکەمو دووهەم روونکەرەوەی سیاسەتی قازانج _ قازانج بۆ دەسەڵاتو بۆ خەڵکە_ و

ئالاَی لیتوانیایی لەسەر بانی هێندێ لە بینا مێژووییەکان. ئەم خەباتـە جەماوەرییـە کـە بـە ڕێبـەری گرووپـی یـەکگرتووی "سـاژودیس" و بـە پشـتیوانی گرووپـەکانی دیکـە پێکهـات، سەرکەوتن و ناوبانگی جیهانی زۆری بەدەست هێنا، بە جۆرێـك کـە دوای ئـەو، چاکسـازییە سیمبولێکەکانی دیکەی دەسەلاَت، بچووکتر دەهاتە بەرچـاو. نموونەیـەکی دیکـە، ڕازیبـوونی سەدام حسێن لەسەر بەڕێوەچوونی بۆنەکانی کەمایەتییە ئایینییەکان لەساڵی٢٠٠٢ی زایینیدا بوو. سەرەڕای ئەوەی کە سەدام لە بەردەم نارەزایەتی و کاردانەوەی سوننەکانی عێراقـدا بـوو، ئیزنی بە شیعەکان دا تا بۆنە ئایینییەکانی خۆیان لە شـوێنە پیرۆزەکـانی دەوروبـەری بەغـدا بەڕێوە ببەن. سەدام حسێن سەرەڕای ئەوە کە هێزە نیزامی و پۆلیسە چەکدارەکانیشـی لـەژێر دەسەلاَتدا بوو و دەیتوانی لەگەڵ خواستی شیعەکاندا دژایەتی بکات، بەلاَم بـۆ پێشـگرتن لـە گرژی و تێکهەڵچوون، لەگەڵ ئەم داخوازییەدا ڕەزامەندی نیشان دا.

ڕەزامەندی دەربڕین بۆ بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی ئـازاد، یـەکێك لـە نموونـە بەرچـاوەکانی چاکسازییە کە ڕژێم ئامادە دەبێت بەڕێوەی ببات، بەلاَم چونکوو هەڵبژاردنەکان لە ژێر کۆنترۆڵ و چاودێری دەسەلاَتدا بەڕێوە دەچـێ، ڕاسـتی و دروسـتی ئـەم جـۆرە هەڵبژاردنانـە لەبـەردەم مەترسی دایە. لە دوو دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەمدا، دەتوانین کۆمەڵێك ڕژێمی سەرەڕۆ ناو بەرین کە ئامادە بوونە هەڵبژاردنی ئازاد بەڕێوە بچێ.

هەڵبژاردنە ئازادەکانی ساڵی١٩٩٠ی بۆرما نیشان دەدا کە چۆن سەرەنجام حکومەتەکان لە بەرانبەر داخوازیی جەماوەردا چۆکدادەدەن.

پێش لەوەی کە ژنراڵ نۆوین لەسەر کورسی دەسـەلاَت بێتـەخوارەوە، یـەکێك لـە کـردەوە فەرمییەکان کە بەڕێوەی برد، ئەوە بوو کە هەموو لایەنە سیاسییەکانی بە هەڵبژاردنی ئازادی حیزبی دەعوەت کرد.

تا پێش مانگی تەموزی١٩٩٨ی زایینی. خەڵکی بۆرما چەند مانگی بـەردەوام دەسـتیان دابووە پێکهێنانی خۆپیشاندان لە پێناو بەڕێوەبردنی هێندێ چاکسـازیی سیاسـی، بەتایبـەت هەڵبژاردنی چەند حیزبی و ئەگەرچی ژنراڵ نۆوین لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە هەڵبـژاردنی چـەند حیزبی دەبێتە هۆی لاوازبـوونی بناغـەکانی دەسـەلاَت یـان لانیکـەم بەشـێك لـە دەسـەلاَتی سەرەڕۆیانەی ئەو، بەلاَم هیوادار بوو کە دەنگەکانی بەرهەڵستکاران لە نێوان حیزبە سیاسـییە جۆراوجۆرەکاندا دابەش ببێت، بەشێوەیەك کە هیچکام لەوان دەنگی زۆرینە بەدەست نەهێنن. سەرەنجام فەرمانی بە کاربەدەستانی حکوومی دا تا لە هەڵبژاردنەکاندا سـاختەکاری بکـەن و

سندوقەکانی دەنگدان پڕ لە دەنگی ساختە بەقازانجی ئەو بکەن، بەلاّم لەهەرحالّدا تەسلیم بوونی ئەو بۆ داخوازیی خەلّك و هەلّبژاردنی چەند حیزبی سەرکەوتنێکی گەورە بوو.

بەشێوەی باو هەلّبژاردنەکان پوانێکە کە رژێمە سەرەڕۆکان بۆ بەڕێوەبردنی چاکسازیی سیاسی، بە بەرهەلّستکارانی دەبەخشن. بەداخەوە زۆربەی رێبەرانی سیاسی ( دەرەوەی دەسەلاّت) بەسادەیی بیردەکەنەوە کە هەلّبژاردن لە ولاّتە نادیموکراتیکەکاندا، ئازادانە و دادپەروەرانەیە و ئەوسا ئەوان دەتوانن لە بەرانبەر تۆقاندن و سەرکوتگەریی رژێمدا بوەستن، یان چاودێری نێونەتەوەیی دەتوانێت پاك و دروستبوونی هەلّبژاردنەکان گەرەنتی بکات. هەلّبژاردنەکانی سربستان لەسالّی٢٠٠٠ی ز. و هەلّبژاردنەکانی زیمبابۆی لەسالّی٢٠٠٢ی زایینی نموونەگەلێك لەو هەلّبژاردنە دەستکردانەن کە بەرنامەڕێژی و ستراتیژیی خەلّك رەوتی ئەوانی گۆڕیوە و دەرەنجامێکی جیاوازی دروست کردووە.

لە سربستاندا گرووپە دژبەرەکانی حکومەت، جۆرە سیستمێکی چاودێرییان بەسەر هەلّبژاردنەکاندا سەپاند کە بەگوێرەی ئەو دەبووایە هەموو سندوقەکانی دەنگدان لە ژێر چاودێری بێلگرادا بژمێردرابا. ئەوان رێکخراوێکی رێکوپێك و راهێنراویان بۆ ژماردنی دەنگەکان ئامادە کرد و تەنانەت بەرنامەیەکی "کردەیی"شیان بۆ پێشگرتن لە دەست تێوەردانی شیمانەیی دەسەلاّتداران لە هەلّبژاردنەکاندا پێکهێنا. هەوالّ گەیاندنی گرووپە سیاسییەکان لە ناوەندەکانی دەنگدان و راگەیاندنی ئاکامی ژماردنی دەنگەکان لەماوەیەکی کورتدا و پێش لەوەی کە ئاکامی فەرمی راگەیەندرێت، پێشی لە دەست تێوەردان لە هەلّبژاردنەکان و لە ئاکامدا بەسەرکەوتنی دیمۆکرسیخوازان کۆتایی پێهات. کاتێك دەسەلاّتداران رایانگەیاند کە لەسەر بنەمای ژماردنی فەرمیی دەنگەکان، گرووپە سیاسییەکانی بەرهەلّستکاری حکومەت سەرنەکەوتن، جەماوەر رژانە سەر شەقامەکان و سەرەڕای رەدکردنەوەی ئەم بانگەشەیە، سەرکەوتنی خۆیان بە خۆپیشاندان دەربڕی. ئەم خۆپیشاندانە بە رێپێوان لە بەرانبەر پەرلەماندا گەیشتە ترۆپکی خۆی. ئامادەیی خەلّك بەرادەیەك بوو کە پۆلیس و هێزە ئینتزامییەکان تا کاتی دەستنیشانکردن و پەژراندی کاربەدەستانی نوێ، خۆیان لە دەست تێوەردان بوارد.

هەلّبژاردنی زیمبابۆی لە٢٠٠٢ی ز.دا ئاکامێکی جیاوازی بوو. گرووپە سیاسییە دیموکراسیخوازەکان، بەرنامەی خۆیان بۆ چاودێری لە سندوقەکانی دەنگدان تەنیا بە بەڕێوەبردنی گوشارە نێونەتەوەییەکان بۆ بەڕێوە چوونی هەلّبژاردنێکی تەندروست و ئازاد

بەستەوە و بەسەرنجدان لەم خاڵە کەمتەرخەمییان نواند کە لەوانەیە بەرپرسی هەڵبژاردنەکان، یانی رۆبێرت موگابی لەهەڵبژاردنەکاندا ساختەکاری بکات. ئەگەرچی نیشانەگەلێك لەدەست دا بوو کە ئەو حەزی لەوازهێنان لە دەسەڵات نییە، بەڵام خەڵك و رێبەران لە ئاست لێکدانەوەی هەڵوێستەکانی ئەو کەمتەرخەمییان کرد. لە ئاکامدا موگابی بە دانی بەڵێنی پارە و خۆراك، جل و بەرگ مەدەنییەکانی بە چەقۆ و تێلاوە خستە گیانی گرووپە سیاسییە بەرهەڵستکارەکانی خۆی و بەم شێوە گرووپە خەباتگێڕە سیاسییەکانی سەرکوت کرد.

پاڵێوراوی گرووپی دیموکراسیخواز بە تاوانی خەیانەت گیرا و پۆلیس و رێکخراوە ئەمنییەکان دەستیاندایە سەرکوتکردنی خەڵك. تەنانەت لەرۆژی بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنەکاندا، ئەو خەڵکەی کە لە ریزی دەنگداندا بوون، لە بەرچاوی هەواڵنێران و راگەیاندنە نێونەتەوەییەکان وەبەر لێدان و کوتانیان کەوتن. زۆربەی هەواڵنێرانی ئەورووپی لە وڵات وەدەر نران و سندوقەکانی دەنگدان لە رۆژی هەڵبژاردنەکاندا جێبەجێ کران. سیاسەتی رژێم، پێشگرتن لە بەشداریی هێندێ لە خەڵك لە هەڵبژاردنەکاندا بوو و هەر لەم ئاقارەدا دەنگێکی زۆر تا پشت راست کردنەوەی ئاکامی کۆتایی نەژمێردران.

سەرەنجام موگابی بێ ئەوەی کە بەرنامەیەکی روون یان توانایییەکی تایبەتی بۆ بەڕێوەبەریی وڵات ببێ، دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت.

گرووپە دیموکراسیخوازەکانیش تەنیا پەنایان بردەبەر رەدکردنەوە و داوای پێداچوونەوە یان هەڵبژاردنی نوێیان کرد و لە حاڵێکدا پێکهاتەی وڵات هیچ بەڵگەیەکی نەبوو کە نیشان بدات هەڵبژاردنی نوێش ئازاد و رێکوپێك نابێ. ئەم نموونەیە وانەیەکی گەورە بۆ گرووپە خەباتگێڕەکانە تا بزانن هەڵبژاردن بۆ حکومەتەکان گرینگییەکی زۆری هەیە، چونکوو لە ئەگەری شکست خواردن لە هەڵبژاردنەکاندا رەوایی سیاسیی ئەوان _ لە ناوخۆی وڵات و لە ئاستی نێونەتەوەییشدا _ نامێنێ. هەروەها هەربەم هۆیەوە، شکست لە هەڵبژاردنەکاندا بۆ گرووپە دیموکراسیخوازەکانیش گرنگی هەیە.

**٣- ناچارکردنی بێ توندوتیژی:**

قبوولکردنی داخوازییەکانی خەڵك بە شێوەگەلی قبوولکردن وگۆڕینی روانگە، بۆ دەسەڵات ئاکامێکی کەم و کاتیی بێ نرخی هەیە. ناچارکردن شێوازێکی ترە کە دەتوانین بە بەکارهێنانیی، دەسەڵات ناچار بە قبوولکردنی داخوازییەکانی خەڵك بکەین.

ناچارکردنی ناتوندوتیژی میکانیزمێکە لە چاکسازی و گۆڕین کە بە پێچەوانەی حەزی دەروونی دەسەڵات، دەبێتە هۆی هاتنەدی ئامانجی خەباتە جەماوەرییەکان. لەم میتۆدەدا پایەکانی رەوایی دەسەڵات، بەهۆی خۆبواردنی خەڵك لە هاوکاری و نەبوونی کۆنترۆڵی کاریگەر لەسەر پارودۆخی هەنووکە لاواز دەبێت و دەسەڵات ناچار دەبێت مل بۆ داخوازییەکانی خەڵك دابنێت.

لە بارودۆخێکدا کە توانای راستەقینەی دەسەڵات لاواز بۆتەوە، بەڕێوەبردنی میتۆدی ناچارکردن کاریگەر دەبێت. گرووپە خەباتکارەکانی خەڵك دەبێ بەباشی ئەم خاڵەیان لەبەر چاو بی و بزانن کە بەکارهێنانی ئەم شێوە جگە لە بارودۆخێکدا کە توانای دەسەڵات لاواز بۆتەوە، دەبێتە هۆی زەبرلێدان لە رەوایی و قبووڵکردنی ئەوان لەلایەن خەڵکەوە. بەکارهێنانی میتۆدی ناچارکردن بۆ ئەوەی کە مانونەمانی رژێمی ستەمکار تووشی ململانێ بکات، دەبێ لە دوای بەرنامەرێژییەکی راست و رێك و لێکدانەوەیەکی ئامانجدار لەسەر رادەی سەرکەوتنی خەبات، بەکار بێت. لە حاڵێکدا کە بەکارهێنانی میتۆدی ناچارکردن یارمەتییەك بە بەئاکام گەیشتنی داخوازییەکانی خەباتگێڕان نەکات، دەبێ بەکارهێنانی ئەم شێوازە دوا بخرێت یان پێداچوونەوەی پێدا بکرێت.

هێندێ جار حیزبە سیاسییەکان و هێندێ لە گرووپە خەباتگێڕە جەماوەرییەکان، داخوازیگەلێك دێننە گۆڕێ کە لەگەڵ شێوازی ناچارکردندا هاوئاهەنگییان نییە. باشترین کات بۆ بەئاگاهێنانەوەی دەسەڵات لە داخوازییەکان، ئەوکاتەیە کە بەرنامەی ستراتیژی نووسرابێت و رەوتی توانا سازی و بەگۆڕەپان هێنانی جەماوەر و لاوازیی سەرچاوەکانی هێزی دەسەڵات بەڕێوە برابێت. لەم بارودۆخەدایە کە داخوازییەکان بە ئامانجێکی روون و شایانی جێبەجێ بوون دەگۆڕێن. وەك نموونە دوای تاوتوێکردنی رێکوپێکی داخوازییەکانی خەڵك و بەرنامەرێژیی ئامانجەکان دوابەدوای داخوازی بۆ بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنێکی ئازاد و تەندروست، (ئەگەر بێت و بارودۆخی سەرەوە ئامادە بێت) دەسەڵات ئاگادار بکرێتەوە کە لە ئەگەری جێبەجێ نەبوونی مەرجەکان و بەدی نەهاتنی داخوازییەکانی ئەوان، چ سزایەك (لە جۆری ناتوندوتیژی) لەلایەن خەڵکەوە بەسەر ئەواندا دەسەپێت.

ئەو کاتەی کە داخوازییەکانی خەڵك سەرەڕای بێ‌مەیلی دەسەڵات جێ‌بەجێ دەبێ، ناچارکردن بە سەرکەوتن دەگات. بۆ نموونە لە هەڵبژاردنەکانی مانگی ئۆکتۆبەری ۲۰۰۰ی زایینی. لە سربستاندا، سەرەڕای ئەوەی کە میلوسۆڤیچ رایگەیاندبوو کە هەڵبژاردنەکان دەبێ

سەرلەنوێ بەڕێوە بچێتەوە، خەڵك ئاهەنگی سەرکەوتنیان لەهەڵبژاردنەکاندا گێڕا. خەڵك کە چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کە لە هەڵبژاردنەکاندا ساختەکاری بکرێ، بە بەرنامەڕێژیی ستراتیژی و بەکارهێنانی شێوازەکانی ناڕەزایەتیی ناتوندوتیژی، توانای حکومەتی "میلوسۆڤیچ"یان کەم کردەوە. سەدان هەزار کەس لە خەڵکی سرِبستان بۆلای پەرلەمان رێپێوانیان کرد و لە بینای پەرلەماندا کۆبوونەوە. سەرەنجام دیکتاتۆری میلوسۆویچ بەم کارە لە دەسەلات وەلا نرا. بەو بەرنامەوە کە خەڵك دایان ڕشتبوو ئیدی دەرەتانی دژایەتیکردن بۆ دیکتاتۆر نەمابوو. چونکوو بناغە سەرە کییەکانی دەسەلاتیی لاواز ببوون. پۆلیس بۆ پێشگرتن لەچوونی خەڵك و نارازییەکان بۆ بێلگراد لەبەستنی ئوتووبانەکان خۆیان بواردو هێزە نیزامییەکانیش بە پشت بەستن بەم بابەتە کە هەڵبژاردن ، رەوتێکی سیاسییە، لە دەست تێوەردان لە ناڕەزایەتییە جەماوەرییەکاندا بەلایەنگری لە میلوسۆویج خۆیان پاراست. رووخانی ئەم دوو پاڵپشتی هێزە (پۆلیس و هێزە نیزامییەکان) ئاکامی چەندین مانگ هەوڵ و رۆشنگەریی خەباتگێران بوو، تا هێزە نیزامی و پۆلیسەکان تێبگەیەنن کە گۆڕینی دیکتاتۆری تەنیا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خەڵکە و هیچ کاریگەرییەکی لەسەر پێگەی کۆمەلایەتی و گرنگیی ئەوان نییە. سەرەنجام میلوسۆویچ بەم ئاکامە گەیشت کە ئیتر دەسەلاتێکی نییە.

لە حالێکدا کە نموونەگەلێك لە سەرکەوتنی شێوازی ناچارکردن، یان هەڕەشە بە ناچارکردن بەشێوازی ناتوندوتیژی هەیە، لە بەرمبەردا، لە هەل ومەرجێکدا کە تواناسازیی پێویست بەرێوە نەچووە و وەرگیراوی پێویست نییە، بەکارهێنانی ئەم میتۆدە دەبێتە هۆی لێدان لە بزووتنەوەی خەباتگێڕی خەڵك، وەکو ئەوشتەی کە لە زیمبابۆی لەساڵی٢٠٠٢ی زایینی. دوابەدوای ئامادە نەبوونی خەڵك لەو بانگهێشتنەدا کە بۆ دوو ناڕەزایەتی و مانگرتنی گشتی رووی دا. ئەم هەلومەرجە بووە هۆی ئەوەی کە رەوتی بەرنامەڕێژی و ئامادەکردنی بارودۆخ بۆ مانگرتنی داهاتوو، بە ماوەی چەند مانگ دوا کەوێت.

هەوڵ بۆ بەکارهێنانی ناچارکردن و میتۆدە جیاوازەکانی، بێ لەبەرچاوگرتنی توانای خەڵك، دەبێتە هۆی بڕینی پشتیوانییەکانی خەڵك و لاوازبوون و زەربەلێدان بە رەوتی بزووتنەوەی دیموکراتێك و تەنانەت هێزە نێونەتەوەییەکانیش، کە تا پێش لەمە لە بزووتنەوەکە پشتیوانییان دەکرد، سەبارەت بە پرستێژ و ئابڕووی بزووتنەوەی دیموکراسیخوازانە دەخاتە شك و گومانەوە. تاوتوێ کردن و هەڵسەنگاندنی توانایی و وزە و تاقەتەکان لە ماوەی بەرنامەڕێژی

و بەڕێوەبردنی خەباتە ناتوندوتیژییەکاندا بۆ پێشگرتن لە بە ئاکام گەیشتنی دەرەنجامە زیان گەیەنەر و ئاکامێکی پێچەوانەی چاوەڕوانییەکان، لە گرنگییەکی بەرچاو بەهرەمەندە.

**٤- داڕووخان:**

لە ئەگەری بە ئاکام نەگەیشتنی ئامانج و داخوازییەکانی خەڵك و پێداگریی دەسەلاَت لەسەر ڕەوتی سەرکوتگەرانەی خۆی، دوا قۆناغ، لەناو چوونە کە ئەویش وەکو میکانیزمەکانی دیکە بەشێوازی ناتوندوتیژی بەڕێوە دەچێ.

لەم میکانیزمەدا، نافەرمانی و متمانە قایلنەبوونی خەڵك بۆسەرچاوەکانی دەسەلاَتی حکومەت، تا ئەو ڕادەیە بەربلاَو و توندوتیژە کە سیستم یان حکومەتی سەرەڕۆ (ناجەماوەری) ئیدی توانای بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای نابێت و بەئاسانی لەنێو دەچێت.

هەروا کە پێشتر باس کرا، "ناچارکردن"ی بەکار هێنراو لەلایەن گرووپە بەرهەڵستکارەکانەوە، ڕەنگدانەوەی بارودۆخێکە کە لەودا دابەشکردنی پێکهاتەی دەسەلاَتی حکومەت گۆڕدراوە. کاتێك کەدژبەران هەست دەکەن کە هاوسەنگی هێز بە قازانجی ئەوان گۆڕاوە، دەبێ ڕژێم لەلایەن هێزی جەماوەرەوە بە ڕەچاوکردنی میتۆدگەلی خۆبواردن لە هاوکاری و مانگرتن بکەوێتەبەر هێرش. ئەگەر هێرشەکان، بەرنامەڕێژی کراو و بەهێز بێت، حکومەت لەبەریەك هەڵدەوەشێتەوە. چونکوو تەکیەگاکانی هێز کە پێویستیی مانەوەی دەسەلاَتن، لەناو چوونە.

ئەگەر گرووپە بەرهەڵستکارەکان بەم ئاکامە بگەن کە رووخانی ڕژێم پێویستە، گوڕوتین وتوانایی خەباتی ناتوندوتیژی تا بە ئاکام گەیشتنی ئامانج دەبێ بەردەوام بمێنێتەوە. ئەگەر بێت و بەهەر هۆیەك هەرجۆرە هەڵە و سستییەك روو بدا، دەتوانێ بۆ دەسەلاَت بەستێنێك درووست بکات تا سەرچاوەکانی هێزی خۆی نۆژەن کاتەوە. هەروا کە لە قۆناغەکانی شەڕی"هێرش و راوەدوونان"دا لەو کاتانەی دا کە توانای بەرنگاری دوژمن لاواز دەبێت و لەحاڵی خۆبەدەستەوەدان دایە، دەبێ توندی و رادەی هێرش کردن تا مسۆگەربوونی سەرکەوتن زیاتر و زیاتر بێت، تا ئەوەی کە دوژمن لەناو دەچێت.

هەروا کە لە شەڕە نیزامییەکاندا، بێبەرنامەڕێژیی ستراتیژی، هێزەکان ناتوانن بۆ وەلاَمدانەوەی خێرا ئامادە بن و بەشێوەیەکی کاریگەر گوشار بخەنە سەر دوژمن، لە خەباتە ناتوندوتیژییەکانیشدا نەبوونی بەرنامەی ستراتیژی، ئاکامێکی وەك یەکی لێ دەکەوێتەوە.

هەڵبەت هەڵبژاردنی شێوازی لەناوبردن دەبێ لە دوای تاقی کردنەوەی هەموو میکانیزمەکان و دڵنیابوون لە ناکاریگەربوونیان بێت، چونکوو بەبێ لێکدانەوەی هەلومەرجی

ئابووری، فەرهەنگی، لێهاتووییەکانی بەدیلی دەسەڵاتی هەنووکە و بنیاتە مەدەنییەکان، لەوانەیە هەڵبژاردنی ئەم میتۆدە ببێتە هۆی بارودۆخێکی مەترسیدار. هەڵبژاردنی ئەم میتۆدە بێ تێگەیشتنی بارودۆخەکە، لەوانەیە تەنانەت ببێتە هۆی لەناوچوونی بنیاتە مەدەنییەکان و پێکهاتنی چەرخەی بێهوودەی سەرەڕۆیی _ سەرەڕۆیی.

هەڵوەشاندنەوە چوارەمین میکانیزمی چاکسازییە لە شێوازی خەباتی ناتوندوتیژیدا، کە دوای ئەوەی کە روون بووەوە کە دەسەڵات حەزی لە بەڕێوەبردنی چاکسازیی نییە، بەکار دەبردرێت. لەم شێوازەدا دەسەڵات یان حکومەت بە هۆی خۆپاراستنی جەماوەر لە هاوکاری کردن و نافەرمانیی هاووڵاتیانەوە لەناو دەچێت.

## شێوازەکانی خەباتە ناتوندوتیژییەکان:

لە راستیدا شێوازەکانی خەباتە ناتوندوتیژییەکان، کاردانەوەی چییەتی میکانیزمی ئەم خەباتانەیە. ئەو شێوازانەی کە گرووپە بەرهەڵستکارەکان دەتوانن بەڕێوەی بەرن، زۆر بەربڵاو و جۆراوجۆرن. لەهاوپێچی یەکەمدا نزیکەی ۱۹۸ شێواز خراونەتە روو کە هەڵبەت شێوازەکانی خەباتی ناتوندوتیژی دەتوانێ زیاتر لەمانە بێت و بیرکردنەوەی خولقێنەرانەی رێبەران لە قۆناغە جیاجیاکاندا دەتوانێ رێکارگەلێکی جیاواز بەرهەم بێنێت.

شێوازەکانی خەباتی ناتوندوتیژی کە دژ بە رژێمە سەرەڕۆکان بەکارهێنراون لەوانەیە بەردەوام بە تۆڵەسەندنەوەی توندوتیژانە رووبەڕوو بێتەوە. تۆقاندن و لێدان و کوتان، زیندانی کردن وسزاکانی دیکە (ئابووری، کۆمەڵایەتی و ...) چاوەڕوان کراون. ئەو کاتەی کە دەسەڵات ئەم شێوازانە بەکار دێنێت، گرووپە خەباتگێڕە دیموکراسیخوازەکان دەتوانن بە بەکارهێنانی پروپاگەندەی بەربڵاو لەم بوارەدا، بە نیشاندانی ستەمکاری و کارە بێ بەزەییەکانی دەسەڵات، پرستیژی رژێم لە بیروڕای گشتیدا بخەنە مەترسییەوە. لە بزووتنەوەی خەباتگێڕانەی سەدساڵی رابردوودا گرتن و زیندانی کردن بووەتە هۆی سەربەرزی و فەخری خەباتکاران.

هەڵبژاردنی شێوازەکانی خەباتی ناتوندوتیژی پێوەندی بە ئامانجگەلێکەوە هەیە کە بەکەڵك وەرگرتن لەم میتۆدە دەستەبەر دەبن. لە هێندێ بابەتدا رێکخراوێك یان بزووتنەوەیەك لە سەرەتادا لەسەر بنەمای لێهاتوویی و تواناکان شێوازی خەبات هەڵ دەبژێرێت و دوای هەڵبژاردنی ئەم میتۆدە، ئامانج هەڵدەبژێرێت. رێك وەك ئەوەی کە لە جیاتی بڕینی رێگاکە لە پلیکانەکانی خوارەوە بۆ سەرەوە، لە سەرەوە بۆ خوارەوە بڕۆین. لە بنەڕەتدا دەبێ سەرەتا

ئامانجەکە تاوتویّ و شرۆڤە بکەین، ئەوکات لەسەر ئەو بنەمایە، ڕێکار و میتۆدگەلێك هەڵبژێرین کە یارمەتی بە ئاکام گەیشتنی ئامانجەکان دەدەن. بۆ تێگەیشتنی باشتری شێوازەکانی خەبات، دەتوانین بە سەر سێ گرووپدا دابەشیان بکەین:

١. ناڕەزایەتی و هاندان.

٢. خۆپاراستن لە هاوکاری کردن.

٣. دەست تێوەردانی ناتوندوتیژی.

## ١- ناڕەزایەتی و هاندان

ناڕەزایەتی و هاندان (بەشێوەی خۆ پارێزی لە توندوتیژی) پانتاییەکی بەربلاوە لە شێوازەکانی خەباتی ناتوندوتیژی کە تیایدا خەڵك بە چالاکیی هێمایی، وەکو شەونخوونی، ڕێپێوان و مانگرتن دژایەتیی خۆیان دەردەبڕن، یان هەوڵ دەدەن دەسەڵات بۆ بەڕێوەبردنی هێندێ چاکسازی هان بدەن. ئەم شێوازانە لەسەر بنەمای دژایەتی دەربڕین و داوای چاکسازی کردنە و شێوازەکانی خۆبواردن لە هاوکاری و مانگرتن لەخۆ ناگرێت.

بەکاربردنی ناڕەزایەتی و هەوڵ بۆ ڕازی کردن، ئەم پەیامە بە ڕژێم دەدا کە خەڵك بە بەکاربردنی گوشار و ناڕەزایەتیی بە کردەوە و سیاسەتەکانی دەسەڵات، خوازیاری چاکسازی دیموکراتیکن.

ناڕەزایەتی بەشێوە سروشتییەکەی، سەمبۆلیك و ڕەمزییە. بەڵام کاریگەریی لەم خاڵەدایە نیشانی خەڵك دەدا کە گرووپە سیاسییەدژبەرەکان، خراپ کەڵك وەرگرتن و سیاسەتەکانی دەسەڵاتیان خستۆتە مەترسییەوە. ئەگەرچی شێوازی دەربڕینی دژایەتی بە شێوەی ناڕەزایەتی و هاندانی دەسەڵات لەهەموو قۆناغەکانی خەباتی ناتوندوتیژیدا شایانی کەڵك وەرگرتنە، بەڵام زۆرترین کاریگەرییەکەی لە قۆناغی سەرەتای خەبات و هاندانی جەماوەر بۆ پەیوەستبوون بە خەباتە.

بەدەر لەوەی کە کام شێوەی ناڕەزایەتی و هاندان کەڵکی لێ وەردەگیرێ، میتۆدەکانی خەبات دەبێ بە شێوەی بەربلاو بەئاگاداریی خەڵك بگات. خۆپیشاندانەکان و ڕاگەیەنراوەکان لە ئەگەری بێخەبەریی خەڵك لەوان، بێمانایە.

نموونەیەکی هەژێنەر لە شێوازەکانی ناڕەزایەتی دەربڕین کە سەرنجی جیهانییانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، لەساڵی١٩٦٠دا لەوڵاتی ڤێتنام ڕووی دا. لە ناڕەزایەتی دەربڕین بە

سیاسەتەکانی ئەمریکا و کوشتاری ئەم ولاتە لە ڤیێتنامدا، چەندین رەببا(راهب) دەستیان دایە خۆکوژیی ئینتحارییەوە. بە رەنگدانەوەی ئەم خۆکوژییە ئینتحارییانە لە راگەیاندنە گشتییەکانی دونیادا، سەرنجەکان روویان لەلای ڤیێتنام کرد و هەرئەمە بوو بە هۆی سەرەتایەك بۆ دەست گەیشتنی خەلکی ڤیێتنام بە ئامانجی گەورەتر. پرۆسە و هەولی خۆکوژی، خەلکی جیهان دەباتە بیرکردنەوەیەکی قولەوە کە، لەچ بارودۆخێکدا و بۆچی کەسانێك بۆ دەربرینی نارەزایەتیی سیاسیی خۆیان، مردنێکی کارەساتبار و جەرگبڕ و هەژێنەر هەلدەبژێرن.

ئەم شێوازە راستەوخۆ لە پالپشتەکانی هێزی دەسەلات نادا. بەلام بە شێوەی ناڕاستەوخۆ دەسەلات ئاگاداری ئەم کارە دەکاتەوە کە خەلك خوازیاری هێندێ ئالوگۆڕ و چاکسازین و ئەوان بۆ تاوتوێ کردنی ئەم خواستانە هان دەدات. خەباتی ناتوندوتیژی زۆر بەربلاوتر لە خۆپیشاندانە نارەزایەتییەکانە.

## ٢- خۆپاراستن لە هاوکاریکردن:

خۆبواردن لە هاوکاریکردن، بەهێزترین ئامرازەکە لە دەست گرووپە بەرهەلستکارەکاندایە. هەلبژاردنی ئاگایانە و بەرنامەرێژیی رێکوپێك لەم بەستێنە لە چوارچێوەی ستراتیژیدا، ئەگەری لاوازکردنی سەرچاوەکانی هێزی دەسەلات فراوانتر دەکات. دەکرێ بە خۆپاراستنی تێکرایی خەلك لە هاوکاریکردن، سەرچاوەکانی هێزی دەسەلات وەك رەوایی، زانست و پسپۆری و ... بخرێتە مەترسییەوە و بۆ ئەم خۆبواردن لە هاوکاریکردنە، هیچ تایبەتمەندییەکی تایبەتی پێویست نییە. هیچ دەسەلاتدارێك بەبێ هاوکاریکردنی جەماوەر ناتوانێ کۆمەلگا بەرێوە ببات. گەورەترین پەیامی خەباتی ناتوندوتیژی ئەمەیە کە" ئێمە جەماوەر لەمە زیاتر لە درێژەی ستەمکاریی دەسەلات لەسەر هاوولاتیان، پشتیوانی ناکەین."و ئامانج لەم میتۆدە لە نارەزایەتی، دژوارکردنی بەرێوەبردنی کۆمەلگا بۆ دەسەلاتە. گرینگترین کاریگەریی خۆپاراستن لە هاوکاریکردن، کاتێك بەرهەم دێت کە شێوازە هەلبژێردراوەکان بۆ خەبات، لەسەر بنەمای بەرنامەرێژی و هاوئاهەنگ بوون بێت و نەك بە کەلك وەرگرتن لە شانس و رووداو ببنە هۆی بە ئاکام گەیشتنی ئامانج.

بە بەکاربردنی بەرنامەگەلی خۆبواردن لە هاوکاریکردن کە مەترسییەکن بۆ تەکیەگاکانی هێزی رژێم و بە بەدەست هێنانی پشتیوانی نێونەتەوەیی، دەکرێ بەرنامەکان بۆ بە ئاکام گەیشتنی ئامانج بەرنە پێشەوە. بەرنامەکانی خۆبواردن لە هاوکاریکردن کە لەسنوورەکانی

نێوخۆ تێدەپەڕی و دەبێتە هۆی ڕاکێشانی سەرنجی نێونەتـەوەیی، بـۆ چاکسـازی و ئـاڵوگۆڕی سیاسی زۆر گرینگن. پشتگیرییە نێونەتەوەییەکان لـە گرووپـە بەرهەڵسـتکارەکانی وڵاتێـك، دەتوانێ بە شێوازی جۆراوجۆر بە ئاکام بگات: خۆپاراسـتن لـە سـەرمایەگوزاری و هـەناردە و هاوردە، ڕەخنەگرتن لە سیاسەتەکانی حکومەتی سەرەڕۆ لە مەیدانی نێونەتەوەییدا، خۆبواردن لە دانی ڤیزا بە کاربەدەسـتانی پایەبـەرز و ئیـداری ئـەو وڵاتانـە، پێشـگرتن لـە هاتوچـۆی هاووڵاتیان بۆ ئەو وڵاتانە و پشتیوانی یان بـەڕێوەبردنی هێنـدێ بەرنامـەی هاوبەشـی مـرۆڤ دۆستانە لەگەڵ ئەو "ئێن.جی.ئۆ"یانەدا کە بە شێوەی ڕاستەوخۆ لە چوارچێوەی مـافی مـرۆڤ لەناوەوە یان دەرەوەی سنوورەکانی ئەم وڵاتەدا چالاکی دەکەن.

لە درێژەدا جۆرەکانی خۆبواردن لە هاوکاریکردن تاوتوێ دەکرێن:

ئـ. خۆبواردن لە هاوکاریی کۆمەڵایەتی

ب. خۆبواردن لە هاوکاریی ئابووری

ج. خۆبواردن لە هاوکاریی سیاسی.

### ئـ . خۆبواردن لە هاوکاریی کۆمەڵایەتی:

خۆبواردن لەهاوکاریی کۆمەڵایەتی، ساکارترین شێوەی خۆبواردن لەهاوکاریکردنە کە هەر تاکێك دەتوانێ بەڕێوەی ببات. بـۆ وێنـە خۆبـواردن لـە هاتوچـۆکردنی کۆمەڵایـەتی لەگـەڵ بنەماڵەی ئەو کەسانەی کە بەشێوازی جۆراوجۆر لەگـەڵ دەسـەڵاتدا هاوکـاری دەکـەن، وەکـو بانگهێشت نەکردنی ئەوان بۆ کۆبوونەوە جەماوەرییەکان، یان شێوازی هاوشێوە. ئـەم کـردەوە دەبێتە هۆی لاواز بوونی پێگەی کۆمەڵایەتیی ئەوان و ئەندامانی بنەماڵەکانیان.

بژاردەکان و ناوازەکانی کاروباری کۆمەڵایەتی، وەکو نووسەران ولێکۆڵەرەکان و... دەتوانن بەسازکردنی دانیشتن و کۆبوونـەوە لـە ئاسـتی کـاریی خۆیانـدا و نـە بەناچـار سیاسـی، بـە بانگهێشت نەکردنی بەرپرسانی حکوومی و بە بەشداری نەکردن لە کۆبوونەوەی هاوشـێوە کـە لەلایەن دەسەڵاتەوە بەڕێوە دەچێ، پڕۆتستۆ و ناڕەزایەتیی خۆیان دەربڕن. ئەم دووری کـردن و هاوڕێیەتی نەکردنە، ئەم پەیامە دەداتـە دەسـەڵات کـە خـەڵك، لەگـەڵ ئـەو کەسـانەدا کـە پشتیوانی لە دەسەڵات دەکەن هەڵناکەن. هەڵبـەت ئـەم میتـۆدە دەبـێ بـە ڕێـك و پێکـی و پارێزەوە بەڕێوە بچێت. لەوانەیە کەڵك وەرگرتنی نابەجێ لەم میتۆدە، ببێتە هـۆی پەشـیمانی

کەسانێك لە دەسەڵات کە لە حاڵی گۆڕینی روانگەی خۆیان و نزیك بوونەوە لە پشتیوانی کردن لەجەماوەرن.

نموونەیەکی دیکە، خۆبواردنی وەرزشکاران و تاکە هەڵکەوتەکان لە بەشداری لە کێبڕکێکان و گۆڕەپانی نێونەتەوەیی دایە، کە دەتوانن لەواندا بۆ رژێم شانازی خولقێنی بکەن. تەنانەت لەبەرکردنی جلوبەرگی تایبەت دەتوانێ نیشانەی ناڕەزایەتی بێت. هەموو ئەم میتۆدانە هەڵگری پەیامی دیاریکراوی جەماوەر بە دەسەڵاتە. لەکاتی کۆڵۆنیالیزمی ئەمریکادا، نوێنەری خۆماڵی بەریتانیا دانی بەوەدانا کە سەرەڕای هەموو هێز و دەسەڵاتێك کە هەیبووە، هەستی کەسێتیی ئەو ئەمەیە کە لەگەڵ ئەودا وەکو زیندانییەك هەڵسوکەوت دەکرێ _ لە دەستوور و فەرمانەکانی ئەو پێڕەوی ناکرێت، هێزە نیزامییە خۆماڵییەکان ئەو بەفەرمی ناناسن، ئەندامانی کڵێساکان لەو دووری دەگرن و خەڵك هیچ مەیلێکیان بۆ گوێڕایەڵی لەو نییە.

### ب. خۆبواردن لە هاوکاریی ئابووری:

لەسەر بناغەی بنەمایەکی روون، کاربەدەستانی حکوومی بۆ وەڵامدانەوە بەو پێداویستیگەلە کە خەڵك چاوەڕوانی دەکەن لێیان، پێویستی بەداهات و توانایی ماڵی هەیە. خۆبواردن لەهاوکاریی ئابووری لە چوارچێوەی ستراتیژیی خەباتی ناتوندوتیژی، لەسەر ئەم بنەمایە دامەزراوە کەخەڵك بە کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەکانی دابین کردنی هێزی ئابووریی دەسەڵات کە لەدەستیاندایە، گوشار دەخەنە سەر دەسەڵات.

بۆنموونە خەڵك بە سنووردار کردن و رەدکردنەوەی چالاکیی ئابووری، وەکو کڕین و فرۆشتنی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان، دەسەڵات لە دابین کردنی پێداویستییەکانی کۆمەڵگا بێهێز دەکەن.

خۆبواردن لە دانی باجەکان، یان دانی بەشێکی کەم لەو، بایکۆتی کاڵا و خزمەتگوزاریگەلێك کە سەرچاوەی داهاتن بۆ دسەڵات، مانگرتنگەلێك کە سەقامگیریی ئابووریی حکومەت دەشێوێنێ، یان دەرهێنانی پارە لە بانکەکان، کە دەبێتە هۆی ناسەقامگیریی بارودۆخی ئابووری لە ئاستی نێونەتەوەییدا، نموونەگەلێکن لە خۆپاراستن لەهاوکاریی ئابووری. سەرەڕای ئەمە لە ئاستی نێونەتەوەییدا، هاندانی شەریکەکان و ناوەندە بازرگانییەکان یان رێکخراوە ناحکوومییەکان بە خۆبواردن لەهاوکاری لەگەڵ رژێمەکان، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر دەستگەیشتن بە ئامانج هەیە و دەبێتە هۆی لاواز بوونی

دەسەڵات. ناسەقامگیریی ئابووری نە تەنیا دەبێتە هۆی لاواز بوونی تەکیەگاکانی دەسەڵات، بەڵکو سنووردارکردنی هێز بەم شێوازە، توانای زەربەلێدان لە دژبەرانی سیاسی و سەرکوتکردنی ئەوان لەلایەن دەسەڵاتەوە دەگرێ.

لە کاتی ئامادەکردنی بەرنامەی ستراتیژیی خەباتی ناتوندوتیژیدا، بەدواداچوون و دیاریکردنی رەوگەی هاتنەناوەوە و چوونەدەرەوەی دراو و نەختینەیی دەسەڵات زۆر گرنگە. ئەم تاوتوێ کردنە دەبێ بە ئامانجی روونکردنەوەی کەم وکورِییەکانی دەسەڵات بەرِێوە بچێ، تا بەخۆبواردن لەهاوکاریی ئابووری، لەم رێگاگەلەوە زەربە لە دەسەڵات بدرێت. لە هێندێ بابەتدا نەختینەیی دەسەڵات لە رێگای فرۆشتنی سەرچاوە سروشتییەکانەوە بەرهەم دێت، یان لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا، بەهۆی لە خوارەوەبوونی حەق دەستی هێزی مرۆیی، حکومەت لە بەرهەم هێنان و فرۆشتنی هێندێ لە بەرهەمەکان قازانج دەکات. لە ئاستی هەناردەکردندا، هەستیارترین بەش، بەشی فرۆشتن و ناردنی کاڵاکانە، کە خۆبواردن لەهاوکاریی ئابووری لەم بەستێنەدا، دەتوانێ زەربەیەکی بەهێز لە دەسەڵات بدات.

**پ. خۆبواردن لەهاوکاریی سیاسی:**

هەموو شێوازەکانی خۆبواردن لە هاوکاری کە لە چوارچێوەی بەرنامەی ستراتیژیدا بەرِێوە دەچن، لە بنەرِەتدا جۆرێکن لە نافەرمانیی سیاسی. ئەم جۆرە شێوازانە بە مەبەستی خستنە مەترسیی رەوایی دەسەڵاتن کە لەبنەرِەتدا پشتیوانی سەرەکی دەسەڵاتن. لایەنی پۆزەتیڤ و شایانی هەڵوەستەی نافەرمانیی سیاسی ئەمەیە کە یارمەتی بە بەهێزکردنی رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بدات؛ چونکوو ئەم بنیاتانە ئەزموون و برِوابەخۆبوون بۆ بەرنگاربوونەوە لەگەڵ دەسەڵاتدا لە چوارچێوەی کومیتەدا لەگەڵ بنیاتەکانی دیکە بەدەست دێنن.

نافەرمانیی سیاسی، هەرِەشەیەکی راستەوخۆیە بۆ دەسەڵات. راگەیەندراوەکان، برِیارنامەکان و ئەو بەڵگەنامانەی دیکە کە رەوایی هێزی دەسەڵات و یاسایی بوونی ئەو دەخەنە مەترسییەوە، ئەم مەسەلە بە خەڵك تێدەگەیەنن کە رەوایی، لە ئەگەری کارامە نەبوونی دەسەڵاتدا، شایانی لێ وەرگرتنەوەیە. بە گەمارۆدانی رێکخراوە حکوومییەکان و کەمبوونەوەی بەرهەمی کاری فەرمانبەرانی خزمەتگوزارییەکان وپیشەسازی و سەدان بابەتی نافەرمانیی مەدەنی دیکە کە لەلایەن زۆربەی خەڵکەوە دەکرێ بەرِێوە بچێ، نافەرمانیی سیاسی بە بەرزترین ئاستی خۆی دەگات و لە ئەگەری بەرنامەرِێژی دروست، هۆشیاری و

سەرنجی خەڵك و ڕێبەرانی خەبات، دەتوانێ هێزی ڕژێمە سەرکوتگەرەکان پووچەڵ کاتەوە و پێکهاتەی دەسەلاّتی ئەوان بڕوخێنێت.

### ٣- دەستێوەردانی ناتوندوتیژی:

ئەو شێوازە ناتوندوتیژییانەی کە دەبنە هۆی لەبەریەك هەڵوەشانی سیاسەتەکان، پێوەندییەکان، شێوەکان، بنیاتەکان و ئاکاری باو، لەسەر بنەمای دەست تێوەردانی ناتوندوتیژی بەڕێوە دەچن. لەوانەیە دەست تێوەردان ببێتە هۆی دروستبوونی شێوەی ئاکاری نوێ، پێوەندی و بنیاتە نوێکان. لەو رووەوە کە ئەم میتۆدانە کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر خستنە مەترسیی بارودۆخی هەنووکە هەیە، دەرەتانی بەدیهاتنی ئامانج و چارەسەری کێشەکان، دەرەتانی خستنەمەترسیی دەسەلاّت و خێرایی بە ئاکام گەیشتنی داخوازییەکان زۆرتر دەکەنەوە. بەلاّم لەسۆنگەیەکی ترەوە، لەوانەیە ئەم میتۆدە بە سەرکوت و توندوتیژی زیاتر و توندوتۆڵ تر بەبەراورد لەگەڵ شێوازەکانی نارەزایەتی و خۆبواردن لەهاوکاری رووبەڕوو ببێتەوە.

دەست تێوەردان دەتوانین بەم شێوە پێناسە بکەین: پێکهێنانی پشێوی لە سیستەمدا لەسەر بنەمای پانتاییەکی بەربلاّو لە شێوازەکانی ناتوندوتیژی کە لە کێشمەکێش و ناکۆکییەکانی نێوان خەڵك و دەسەلاّتدا بەکار دەبردرێن. شێوازەکانی ئەم میتۆدە، جیاوازییان هەیە لەگەڵ نارەزایەتی و خۆبواردن لەهاوکاریی لەگەڵ دەسەلاّتدا. دەست تێوەردان بۆ ناکۆکی نانەوە لەناو دەسەلاّتدا، زیاتر لەشێوازگەلی فیزیکی وەکو مانگرتن لە دانیشتن، یان شێوازە دەروونی، کۆمەلاّیەتی، ئابووری یان سیاسیەکان کەڵك وەردەگرێ.

مێژووی هاوچەرخی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، پڕە لە زۆرێك لە دەست تێوەردانی هێزە جەماوەرییەکان کە بوونەتە هۆی گۆڕانی ڕێبازەکان و پێوەندییەکان. لە درێژەی خەباتی مەدەنی بۆ دەستڕاگەیشتن بە مافی کۆمەلاّیەتی هاوولاّتییان، مانگرتن گەلێك لە دانیشتنی خەڵك لە ڕێستۆرانەکان بۆ نارەزایەتی دەربڕین لە جیاکردنەوەی نەژادی، لە کۆتایی هێنان بەم شێوازە ئاکارییەدا کارتێکەری ڕاستەوخۆ و کاریگەریان هەبوو. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم دەست تێوەردانانە بوونە هۆی کاڵ بوونەوەی ئاکاری نەژاد پەرستانە، پێویستی و هەنگاوی خێرا بۆ یاسایی کردنەوەی لابردنی جیاکردنەوەی نەژادیشی لە ڕەهەندێکی گەورەتردا لە رای گشتیدا ئاشکرا کرد. بە تێپەڕینی چەندین دەیە لە بە ئاکام گەیشتنی ئەم میتۆدانە، توندوتیژی

بەکاربراو لە بەرانبەر ئەم میتۆدانەدا لەبیر کراوە. کۆبوونەوەکانی خەڵك لە هێندێ بابەتدا لەگەڵ کوتان و لێدانی پۆلیسدا رووبەڕوو بۆتەوە . ئەم شێوازگەلە کە زۆرجار دەسەلاَت دەیویست بەتوندی سەرکوتیان بکات، دەسپێکەری خەباتی جیو- جیتسۆ بوونە. خەباتی جیو- جیتسۆ، هێزی سەرکوتگەر و بەهێز و توندوتیژانەی دەسەلاَت کە لەسەر ناڕازییانی توندوتیژی نەخواز بەڕێوە دەچوو، دەکردە هێزی گوشار خستنەسەر بۆ بە ئاکام گەیشتنی دادپەروەری و دژ بە خودی دەسەلاَت بەکار دەبردرا. لە خەباتی جەماوەری ناتوندوتیژی و ستراتیژی دا، ئەو هێزی گوشارە کە بۆ بە ئاکام گەیشتنی دادپەروەری بەکار دەبردرێ، لەوانەیە بنیاتێکی جەماوەری لە ناوخۆی ولاَتدا نەبێ، بەڵکو هێزە نێونەتەوەییەکان و رێکخراوە جیهانییەکان ئەم هێزە لەسەر دەسەلاَت بەکار ببەن.

دەتوانین سەقامگیربوونی هێزە نێونەتەوەییەکانی داکۆکیکاری ئاشتی لەساڵی ٢٠٠٢ لە (ئاچە)[1] وەکو دەست تێوەردانی نێونەتەوەیی ناو بەرین. ئەم هێزانە بۆ پشتیوانی و هاوکاری لەگەڵ خەڵکێکدا نێردرابوونە ئەو ولاَتە کە خوازیاری مافی مەدەنی و مرۆیی خۆیان و هەروەها سەربەخۆیی و ئۆتۆنۆمی لە ئەندەنوسیا بوون و لەبەردەم هێرشی توندوتیژانەی بەرهەڵستکارانی گۆڕینی پێوەندیی هێز(دەسەلاَت) لە ئەندەنوسیا بوون. بوونی ئەم هێزانە پێشی بە توندوتیژیی حکومەتی ئەندەنوسیا لەسەر خەڵکی ناڕازی و جەماوەر گرت. نموونەیەکی دیکە لە دەستێوەردانی نێونەتەوەیی، جێگیربوونی هێزە بیانییەکان لە فەڵەستیندا بوو. ئامادە بوونی ئەم هێزانە وەکو قەڵغانێك پێشی لە پێکدادانی توندوتیژانەی هێزە نیزامییەکانی ئیسرائیل و کۆچەرانی تازە نێشتەجێ بووی ئیسرائیلی لە ناوچەکانی فەڵەستین لەگەڵ خەڵکی فەڵەستیندا گرت.

دەست تێوەردان دەتوانێ ببێتە هۆی لاوازبوونی تەکیەگاکانی هێز و یارمەتیی خێرای لەناوچوونی دەسەلاَت بدات. بە ستراتیژییەکی ژیرانە، دەتوانین لەو هەلانەی کە پێش هاتوون بۆ بەرنامەی خەبات بە باشترین شێوە کەڵك وەرگرین. بێ ستراتیژی و بەرنامەگەلێك کە پێداویستییەکان و شرۆڤە و لێکدانەوەی بارودۆخەکە لەبەرچاو ناگرن، هەلەکان لە دەست دەچن. لە دەستدانی هەلەکان دەبێتە هۆی ئەوەی کە دوژمن دەرفەتی زیاتر وەدەست بێنێ تا دەست بداتە نۆژەن کردنەوەی وزەی لە دەست چوو و رێکخستنی دووبارە و بەپێچەوانەوە،

---

(١) Ache لە ئەدەنوسیا.

سەخت و دژوارکردن یان دەست تێوەردان، بنیاتە حکوومییەکان دەخاتە بیری ئەوە کە دەست تێوەردان، هەڕەشەیەکی جیددی و راستەوخۆیە، کەوابوو، بەگوشار خستنە سەر رژێم، خوازیاری کۆتایی هێنان بە بارودۆخی هەنووکە _ تەنانەت بە توندوتیژی نواندن لەسەر خەڵکیش_ دەبن. بۆ پێشگرتن لە فۆرم گرتنی بیروباوەڕێك کە لایەنگرانی رژێم تووشی پەشێویی فیکری و دەروونی دەکات، دەبێ لەپێشدا پڕۆپاگەندە و راوێژکاریگەلێك لەگەڵ سەرچاوەکانی هێزی دەسەڵاتدا بەرێوە بچێ.

| شێواز | ئەنجام |
|---|---|
| نارەزایەتی و هاندان | گۆرینی روانگە(دیدگا) |
| خۆ پارێزی لە هاوکاری | قبوڵ کردن |
| دەست تێوەردان | ناچارکردن |

## گرنگیی بەرنامە رێژیی ستراتیژیك لە رووبەڕووبوونەوە جەماوەرییە ناتوندوتیژییەکاندا:

سوود وەرگرتن لە بەرنامە ستراتیژییەکان لەناو سوپا و زانستی نیزامیدا باوە. لەماوەی سەدە یەك لەدوای یەکەکاندا فەرماندە نیزامییەکان، سەرنج و گرنگییەکی تایبەتیان داوەتە بەرنامە رێژیی ستراتیژی و کەڵك وەرگرتن لێی لە چالاکییە نیزامییەکان. بژاردە سوپاییەکان وەکو سانتزیوو،[1] کلازویچ[2] و لیدێل[3]، کەموکورتی ئەم بەرنامانەیان هەڵسەنگاندبوو و چاکیان کردبوویەوە. لە شەڕە باو و شەڕە (چریك)[*]ییەکاندا، یەکەم هەنگاو بۆ سەرکەوتن سوود وەرگرتنە لە بەرنامە شارەزایانە ستراتیژییەکان.

(1) Sun Tzu
(2) Clausewitz
(3) Lidell

(*) بەو هێزە چەکدارانە دەگوترێت کە هیچ مەشقێکی سەربازییان نەکردووە، واتە بەشێوەیەکی خێڵەکی و ناسەربازییانە دەستیان داوەتە چەك.

هەر بەو شێوازە کە شەڕە نیزامییەکان پێویستیان بە بەرنامەڕێژیی ڕێك و پێك و بەڕێوەبردنی ورد هەیە، خەباتی جەماوەریش زۆر پێویستیی بەوەیە و تەنانەت لە هێندێ بابەتدا گرنگیی بەرنامەڕێژی لە خەباتی جەماوەریدا بەبەراورد لەگەڵ شەڕە نیزامییەکان گرینگترە. کارامەیی خەباتەکان لە ئەگەریی دروست کردنی بەرنامەڕێژییەکی بەربڵاو و بەڕێوەبردنیدا، بەشێوەیەکی بەرچاو پەرە دەستێنێت.

خەباتی ناتوندوتیژیی ستراتیژی خەباتگەلێکن دوور لە توندوتیژی کە لەسەر بنەمای بەرنامەی ستراتیژی دانراون" بەرنامەیەك کە بە لەبەرچاوگرتنی شرۆڤەکردنی بارودۆخی جێی ناکۆکی، بەهێزی و لاوازیی گرووپە رقەبەرەکان، لێهاتوویی و پێشەکییە پێویستییەکانی تەکنیکەکانی خەباتی ناتوندوتیژی و بەتایبەت بنەما ستراتیژییەکانی ئەم جۆرە خەباتە تایبەتییانە دروست بوونە.

ستراتیژی لە خەباتە ناتوندوتیژییەکاندا بەمانای بەرنامەیەکە بۆ ڕێنمایی هێڵی سەرەکیی خەبات یان ڕێبازێك کە لە ناخی ستراتیژیی گەورەدا دانراوە، بۆ ڕێنمایی کۆی بەرنامەی ستراتیژی، بیرۆکەی سەرەکی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی خەبات و پەرەپێدانیەتی و لەسەر چۆنیەتی جێگرتنی بەشە جۆراوجۆرەکانی خەبات لە پاڵ یەکتردا لێ دەکۆڵێتەوە تا بە باشترین شێوە بە دەسکەوتەکانی ئاکامەکە بگات.

ستراتیژی(ڕێکار)ی لە چوارچێوەی ستراتیژیی گەورە و ئامانجەکانیدا کردەیی دەبێت. بۆ بەڕێوەبردنی ستراتیژی لە چوارچێوەی ئامانجی سەرەکیی خەبات لە ئەندازەی بچکۆلەتردا، ڕێکار و میتۆدگەلی تایبەت بەکار دەبردرێت.

## گرنگیی بەرنامەڕێژیی ستراتیژێك:

کاتێك کە مرۆڤ بۆ بەڕێوەبردنی کارێك بڕیار دەدات، ئەگەر بە هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکان و بەرنامەڕێژی بۆ بەهرەمەندبوون لەوانەوە سەرقاڵ بێ، زۆرترین کارایی کردەوەیی بەدەست دێت و لە ڕاستیدا بەباشی هەنگاو بۆ بە ئاکامگەیاندنی ئامانج هەڵدەگرێ و ئەمە لە ڕاستیدا پێویستی بە بوونی بەرنامەیەکی ستراتیژی هەیە کە ڕەوگەی ڕۆیشتن لە کاتی ئێستاوە وەکو سەرەتا (کە ئامانجەکان بە ئاکام نەگەیشتوون) بەرەو داهاتوو وەکو ئامانج ( کە ئامانجەکان لەو کاتەدا دەبێ بە ئاکام بگەن) بکێشێ. بەرنامەی ستراتیژی بۆ گەیشتن بە ئامانج دەبێ

ڕێکارگەلی پێویست بکێشی و هەروەها شێوازی گەیشتن بە ئامانجی داهاتوو بە سەرنجدان بە بارودوخی هەنووکە روون بکاتەوە.

بۆ نموونە ئەگەر کەسێك بیەوێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی بڕوات، دەبێ سەرەتا پلانی شوێنەکە، رادەی کات، کەرەستەی رۆیشتن و پێداویستییەکانی دیکە بەشێوەی روون و ریك و پێك ئاشکرا بکات" ئایا کەرەستەی سەفەرکردن ئاسمانییە یان وشکانی یان ...و ئایا لە باری مالییەوە دەکرێ تێچووی سەفەرەکە دابین بکرێت، قۆناغەکانی سەفەر کامانەن، لە چ قۆناغێکدا دەبێ وزەی لە دەست چوو بەدەست بێنێتەوە یان وچان بدات و لە چ قۆناغێکدا دەبێ تونتر یان هێواش تر بڕوات، بۆ سەفەر چ بەلگە و دیکۆمێنتێك پێویستە، لە کاتی سەفەردا لە ئەگەری نەبوونی هێندێ کەس و پێداویستی، دەبێ لە پێشدا هێندێ جێگرەوە دابین بکرێ و زۆرێك تێبینی و دووربینی دی لەبەرچاو بگیردرێ.

ئەم بەرنامەڕێژییە کە خەلکی سیڤیل لە کاروباری رۆژانەدا کەلکی لێوەردەگرن، دەبێ سیمبولێك بێت بۆ رێبەرانی خەبات، تا بەم شێوە بۆ بزووتنەوە سیاسی و کۆمەلایەتییەکان بەرنامەڕێژی بکەن. بەداخەوە بزووتنەوە خەباتگێڕەکان، بەوجۆرەی کە دەبێ سەرنج بدەنە بەرنامەڕێژیی ستراتیژی و گرنگییەکەی، سەرنجیان نەداوە. هێندێ لە خەلك و رێبەرانی خەبات وا بیردەکەنەوە کە تەنیا خەباتێکی بەهێز، بەردەوام و شێلگیر بەدلنیاییەوە سەرکەوتوو دەبێت. هێندێکی دی وادەزانن کە تەنیا پابەندبوون بە ئامانجەکان، ئایدیالەکان، ئارمانجەکان و باوەڕ بەوان _ سەرەڕای ئەو چارەڕەشی و بەدبەختییانەی کە بەشان دەیکێشن _ تەنیا کارێکن کە دەتوانن بۆ گەیشتن بە ئامانج بەرێوەی ببەن.

پێبەندبوون بەئامانجەکان، هیواکان و وەفادار مانەوە بەوان کارێکی دلخوازە، بەلام لە روالەتدا ئەم پێبەندبوونە هیچ رێگایەك بۆ بە ئاکام گەیشتنی ئامانجەکان و تێپەڕین لە بارودۆخی هەنووکە پێك ناهێنێ.

بەدلنیاییەوە هەول و تێکۆشان بۆ گۆڕینی بارودوخی کۆمەلگا یان پێشگرتن لە ئالوگۆڕی ناپەسند، یان ئازادکردنی ولات لە داگیرکاریی دەرەکی یان بەرگری لە ولات لە بەرانبەر هێرشی بێگانەکاندا، زۆرزۆر ئالۆزتر لە نموونەی "سەفەرکردن"ە و بەرنامەداڕشتن بۆیان دژوارترە.

لەم سەردەمەدا ژمارەیەکی کەم لە بزووتنەوە جەماوەرییەکان کە بەدوای ئامانج و ئارمانی بەرزترەوەن، بۆ بەرنامەڕێژییەکیی ستراتیژی بەربلاو و ئامانجدار هەنگاو دەنێن.

زۆرجار لە بزووتنەوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا، گرووپە جەماوەرییەکان و ڕێبەران، خاوەن فامێکی سنووردار لە بەرنامەڕێژیی کورت، بەشێوەی تایبەت یان تاکتیکە سەرەتاییەکان و بنەما بنەڕەتییەکانن و بۆ چارچێوەبەندی و فۆرمۆڵەکردنی بزووتنەوە لە مەودایەکی زەمەنی درێژ بە ئاسۆیەکی بەربلاوتر و دارشتنی بەرنامەیەکی ستراتیژی هەوڵ نادەن.

یەکێك لە هۆکارەکانی سەرنج نەدان، رەنگە ئەوە بێ کە ئەوان باوەڕیان بە بەرنامەڕێژیی ستراتیژی نییە، یان ئەوەی کە لە قۆناغی سەرەتایی خەباتدا توانایی، ئامادەیی بیرکردنەوە و شرۆڤەی ستراتیژییان نییە، یان ئەوەی کە لەجێگەی سەرنجدان بە ئامانجی گشتی و هەموو قۆناغەکانی خەبات، تەنیا بیر لە بڕگەیەکی دەکەنەوە.

زۆرێك لە ڕێبەران و گرووپە جەماوەرییەکان بەشێوەی دووپاتەوەبوو، کەوتوونەتە ناوگێژاوی دەسپێشخەرییەکان و پیلانی دوژمنەوە و خەریکی خۆسازکردنن بۆ وەڵامدانەوەیان. لەم بارودۆخەدا ڕێبەران بەخێرایی و سەرلێشێواوی، تەنیا خۆیان بە چالاکیی رۆژانە و کاتییەوە خەریك دەکەن و لە ڕێکخستنی سەرچاوەکان، کات دیاریکردن بۆ خەبات و دارشتنی بەرنامەیەکی ستراتیژی کەمتەرخەم دەبن.

دەبێ ئەم ڕاستییە قبووڵ کەین کە لە هێندێ بابەتدا خەڵك و ڕێبەرانی بزووتنەوە بەم هۆیەوە بەدارشتنی بەرنامەیەکی ستراتیژییەوە خەریك نابن، چونکوو هیوایەکیان بە گەیشتن بە ئامانج و بە ئاکام گەیشتنی ئارمانەکان نییە و گەیشتن بەوان بە مەحاڵ دەزانن. ئەوان تا ئەو ڕادە خۆیان بە لاواز دەزانن کە وەکو دۆڕاوێکی بێهێز چاو لە خۆیان دەکەن کە ناتوانن توانایی درێژەدان بەخەبات لەخۆیاندا بەهێزتر بکەن و بەم ئاکامە دەگەن کە تەنیا کارێك کە لە دەستیان دێت، ئەوەیە کە سەرشۆڕانە بینەری ستەم و سەرەڕۆیی بن و بەقبووڵکردنی ئەو بارودۆخە بەبێ هیچ هەوڵێك، لە حاڵێکدا بە ڕاست و درووست بوونی هیواکانیان باوەڕیان هەیە، بارودۆخی هەنووکە قبووڵ بکەن.

دەرەنجامی هەموو ئەم بیروباوەڕانە، بیرنەکردنەوە، بێباوەڕی و سۆزدارنەبوون بە بەرنامەی ستراتیژییە.

بەرنامەڕێژی نەکردن و دانەڕشتنی ستراتیژی ئاکامێکی جگە لە کەمبوونەوەی شانسی سەرکەوتن و زۆرکاتیش ئامێکی جگە لە دۆڕاندن بەدواوە نابێت" چونکوو ئاکامی بێبەرنامەیی دەبێتە پرش‌وبلاوی هێزەکان، کەمبوونەوەی کارامەیی و کردەوە، لەناوچوونی

هێزەکان و ڕێزدانەنان بۆ دەسکەوتەکانی چالاکان وخەباتگێڕان. ئەمانە تەنیا بەشێکن لە تێچووەکانی بەرنامەڕێژی نەکردن و شکستهێنانی دووبارە و بە ئاکام نەگەیشتنی ئامانجەکان، ئاکامی بێ بەرنامەیی بزووتنەوە جەماوەرییەکانە.

## بزووتنەوە و خەباتی بێ فۆرمۆڵەبەندی:

- وزە و توانایی هێزەکانی بزووتنەوە بەرەو لای ئامانجی بچووك و بابەتی ڕواڵەتی لادەدا و بە خەسار دەچێت.
- هەلەکان بۆ دەست گەیشتن بە ئامانجەکانی خەبات لەدەست دەچن.
- هەنگاوە سەرەتاییەکانی دوژمن، شێوەی کردار و ڕەفتار لەناو خەباتەکاندا دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە و ڕەوتەکەی دیاری دەکات.
- لە ئەگەری ڕووبەڕووبوونەوەی خەبات لەگەڵ قەیراندا، دەرەتانی ساخکردنەوە و قەرەبووکردنەوە نییە و لاوازی و لێکهەڵوەشانەوە بەردەوام پەرەدەستێنێ و گورزگەلێکی تێکدەرانە و قەرەبوونەکراو لە بزووتنەوە دەوەشێنێت.
- هەوڵەکان بۆ بە ئاکام گەیشتنی سەرکەوتن و شانسی گەیشتن بەئامانج کەم دەبێتەوە.

لە بەرانبەردا، فۆرمۆڵەکردن و باوەڕ بە بەرنامەی ستراتیژی بەهێز، شانسی سەرکەوتن دەباتە سەرەوە. چالاکییە ڕێکخراوەیی و ئاراستەکراوەکان لە چوارچێوەی بەرنامەی ستراتیژیدا، خەڵك و ڕێبەران لە کۆبوونەوە لەسەر توانایی و وزەکان بەهێز دەکات تا بەجێ گرتن لە پڕۆسەیەکی ئامانجداردا، بۆسەرکەوتن هەنگاو هەڵێننەوە. ئەوان دەتوانن بەدرێژەدان بە بەرنامە و ڕێچکەکان هاوکات لەگەڵ بەکردەیی کردنی چالاکییەکان، لایەنە لاوازەکانی دوژمن دەستنیشان بکەن کە لەم دۆخەدا زیانەکان و تێچووەکان کەم دەبنەوە و لە ئەگەری بوونی قوربانیی شیمانەییدا، لەناوچوونی ئەوان بەبێ هۆ و بێ کاریگەری نابێت. لەم قۆناغەدا شانسی سەرکەوتنی خەباتە جەماوەرییەکان زۆرتر دەبێت.

## فۆرمۆڵەکردنی ستراتیژیی لۆژیکییانە(ژیربێژانە) بۆ خەبات:

هەڵبژاردن و فۆرمۆڵەکردنی ستراتیژییەکی عەقلانی پێویستی بە:

* تێگەیشتنی دروست و لۆژیکی لە چییەتی و چەمکی ریشەیی، بەستێنێکە کە خەبات تێیدا فۆڕم دەگرێت.

* دیاریکردنی جیاوازیی زاتی و بنەڕەتی لە نێوان پێگەی هەنووکەیی بزووتنەوە و ئەو پێگەیەی کە دەیەوێ پێی بگات.

* تاوتوێکردنی دروستی ئەو بەربەستانە کە لە بەردەم گەیشتن بە ئامانجدا هەیە و ئەو هۆکارانەی کە خێرایی بە بە ئاکام گەیشتنی ئارمانەکان دەدا.

* شرۆڤە و لێکدانەوەی لاوازی و تواناییەکانی دوژمن، گرووپە خەباتگێڕ و هێزە سێهەمییەکان کە دەتوانن یارمەتی بدەن لە بە ئاکام گەیشتنی ئامانجەکان یان بەربەستێك بن بۆی.

* شرۆڤەی ئاڵۆزییەکان، لاوازییەکان و سنووردارێتیی رێکارە شاراوە(پەنگراوە) جیاجیاکان و هەڵسەنگاندنیان لەگەڵ تواناییەکانی تاك یان گرووپێك کە بڕیارە ئەوە بەڕێوە ببات.

* هەڵبژاردنی چالاکترین و باشترین بەربژار لەنێوان ئەو بەربژارانەدا کە هەیە، یان کێشانی رێبازێکی تەواو نوێ.

* دیاریکردن وکێشانی بەرنامەی گشتیی چالاکییەکان کە بریتین لە بەرنامەگەل قۆناغی بچووك تر و رێکاری پێوەندیدار بەوانەوە کە هەرکام لەم قۆناغگەلە ئامانجی پێوەندیدار بەخۆیانیان هەیە کە لە کۆتاییدا دەبنە هۆی گەیشتنی بەرنامەی گشتی بە ئامانج و بە ئاکام گەیشتنی ئامانجی سەرەکی. بەدەربڕینێکی دی، بەرنامەی ستراتیژی خۆی لە چەند ژێربەرنامە پێك دێت کە رێکار و میتۆدی تایبەت بە خۆیان هەیە و هەنگاوەکانی ئەوان پایەکانی بەرنامەی سەرەکیین.

## ئاستەکانی بەرنامەڕێژیی:

رێبەرانی خەباتەکان لە داڕشتنی بەرنامەی ستراتیژیدا دەبێ بزانن کە قۆناغ و ئاستێکی جیاواز بۆ بەرنامەڕێژی هەیە. بەرزترین ئاست، ستراتیژیی گەورەیە، دوای ئەو ستراتیژیی کاتی و بەدوای ئەودا رێکار و شێوازی دی هەیە.

## ستراتیژی گەورە، ستراتیژییە کاتییەکان، تاکتیك (ڕێکار)ەکان، شێوازەکان.

**ستراتیژیی گەورە:** ستراتیژیی گەورە چوارچێوەیەکی گشتی و بەستێنێکی بنەڕەتییە کەهەوڵ دەدا بۆ هاوئاهەنگی و ئاراستە کردنی ئەو سەرچاوانەی کە هەیە و ڕێکخستنی گشتیی سەرچاوە ئابووری، مرۆیی، مەعنەوی و سیاسییەکان و هتد.. و بزووتنەوە جەماوەرییەکان بۆ گەیشتن بە ئامانج.

ستراتیژیی گەورە بریتییە لە دیتن و هەڵسەنگاندنی حەقیقەتی ئامانجەکانی بزووتنەوە ، هۆکارەکانی دی کە لەوانەیە لە قۆناغە جیاجیاکاندا کاریگەر بن و هەڵبژاردنی هونەر و میتۆدی بەڕێوەبەریی.

بۆنموونە ستراتیژی دیاری دەکا کە خەبات بە شێوەی ناتوندوتیژی بێت یان بە شێوەی تۆختر. چۆن ئامانجەکان دەبێ بە ئاکام بگەن و دەرەنجامە درێژماوەکانیان کامانەن. ستراتیژیی گەورە چوارچێوەیەکی گشتی بۆ هەڵبژاردنی ستراتیژییەکانی ئاست خوارتر کە بۆ خەبات بەکار دێن، دیاری دەکات. ئەم ئاستە بریتییە لە دابەشکردنی چالاکییەکان لەنێوان گرووپە دیاریکراوەکان وتەرخان کردنی پێداویستی و سەرچاوەکان بەوان و گرنگتر لە هەموو ئەمانە، ئەم ستراتیژییە دەبێ بەشێوەیەکی روون، پێوەندی نێوان شێوە جیاجیاکانی خەبات و شێوازەکانی بە ئاکام گەیشتنی ئامانج دیاری بکات.

ستراتیژیی گەورە ستراتیژییەکی گشتگیرە بە چەمك و چوارچێوەیەکی پەرەگرتوو کە ئامانجی گشتیی خەبات، ستراتیژییە کاتییەکان، شێوازەکان، ڕێکارەکان وسەرچاوەکانی خەبات دیاری دەکات. ستراتیژیی گەورە لە هەموو ئەوسەرچاوە گونجاوانە کە لەبەردەست گرووپدایە کەڵك وەردەگرێ (سیاسی، مرۆیی، ئابووری، ئاکاری و هتد) تا بەستێنی دەست گەیشتن بە ئامانج پێك بێت.

لەوانەیە ستراتیژیی گەورە، بریتی بێ لە چەند ستراتیژیی کاتی بۆ دەست گەیشتن بە ئامانجی تایبەت لە قۆناغە جیاجیاکانی خەباتدا.

**ستراتیژییە کاتییەکان:** مەبەست لە ستراتیژییە کاتییەکان داڕشتنی باشترین شێوەی گەیشتن بە ئامانجە. چڕبوونەوەی ئەم ستراتیژییانە لەسەر کات، بۆ چییەتی و چۆنیەتی خەبات و ئەمەیە کە چۆن دەکرێ بە بەرزترین ئاستی کارامەیی بگەیت. ستراتیژیی کاتی بەرنامەی

دابەشکردنی کردەیی، کارامە و شێوازی کەڵك وەرگرتن لە کەرەستەی لەبەردەست بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانە.

لەوانەیە ستراتیژی بریتی بێ لە هەوڵ و تێکۆشانێك کە پێویستن بۆ پەرەپێدانی بارودۆخێکی ستراتیژی و گۆڕینیی بە بەنرخترین حاڵەت و بەدەستهێنانی سەرکەوتن بێ پەنابردنە بەر خەباتی ئاشکرا (گۆڕینی هێندێ لە هەڕەشەکان بۆ هەل).

بەسەرنجدان بە چییەتی خەبات، بیری ستراتیژی، ئەندێشەیەکی سیاسییە بۆ چۆنیەتی گەشە و پەرەپێدانی بەرنامەی خەباتگێڕی و چۆنیەتی تێکەڵ کردنی ئەندامە پرژوبڵاو و جیاجیاکانی، تا بەشێوەیەکی سوودمەند بۆ گەیشتن بە ئامانج بە یەکترییەوە پێوەند بدرێن. ستراتیژی بریتییە لە دیتن و هەڵسەنگاندنی دەرەنجامەکانی سەرچاوەگرتوو لە چالاکییەکان و ئاکامە شیمانەییەکانی بەرهەم هاتوو لێیان. گەشەی چالاکییەکانی بەرنامەی گشتی، هەناردنی بەرنامە بە رووەکانی خوارەوەتر، رێکخستنی ژیرانەی گرووپە جیاجیاکانی خەبات لە چالاکییە جیاجیاکاندا، لەبەرچاوگرتنی پێداویستییەکان بۆ بەکردەیی کردنی رێکاری هەڵبژێردراو و لە ئەگەری دەست گەیشتن بە سەرکەوتنە کاتییەکاندا، بەرزنرخاندنی ئەوان وکەڵك وەرگرتنی باشتر لەوان لە کۆی ئەو بابەتانەیە کە لە بەرنامەی ستراتیژیدا دەبێ لەبەرچاو بگیردرێت.

ئەو ستراتیژییانەی کە لە ئاستی خوارەوەدان لە چوارچێوەی ستراتیژیی دایکدا کار دەکەن. تاکتیك(رێکار)ەکان و میتۆدەکان کەرستەی بە ئاکام گەیشتنی ستراتیژییەکانن.

بۆ دەست گەیشتن بە باشترین کارامەیی، دەبێ تاکتیکەکان و میتۆدەکان لە ئاقاری بە ئاکام گەیشتنی ستراتیژی و هاوهەنگاو لەگەڵ پێداویستییە پێویستەکان بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن، هەڵدەبژێردرێن و کەڵکیان لێ دەگرن.

لە فۆرمۆڵەکردنی ستراتیژی بۆ خەباتی ناتوندوتیژی، دەبێ سەرنج بەم چەمکانە بدرێ:

ئامانجەکان، سەرچاوەکانی هێزی خەبات، ئامانجی دەسەڵات، سەرچاوەکانی هێزی دەسەڵات، رۆڵی کردەیی و پەنگراوی هێزە سێهەمییەکان[1]، رێکارەکان و شێوازەکانی کردەوە و دژکردەوەی شیمانەیی دەسەڵات، رێکارەکان وشێوازەکانی کردەوە و دژکردەوەی کۆمەڵایەتی بزووتنەوەی خەبات (دژکردەوەکانی بەرگری و پەلاماردەرانە) پێشەکییە پێویستەکانی کارێك و پێداویستییەکانی ئەم میتۆدە بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن، دینامیزمناسیی خەبات و

(١) مەبەست لەهێزی سێهەم بیروڕای گشتیو رێکخراوە نێونەتەوەییەکانە - و.

شـرۆڤەکردنی لــە بــارودۆخی بگــۆڕدا و ســەرەنجام هەڵســەنگاندنی میکــانیزمی ئــاڵوگۆڕ و گۆڕانکارییەکان و کاریگەرییان لەسەر خەبات و شێوازەکانی.

**تاکتیك( ڕێکار)ەکان:** تاکتیك بەرنامەیەکی سنووردار و کاتییە لە هــەموو بەرنامــەکانی خەبات و چالاکییەکانی. لە پرۆسەی ڕێکخستنی تاکتیکدا ئەم بابەتە لە بەرچاو دەگیردرێ کە چۆن دەبێ لە کەرەستە و ئامێری بارودۆخی هەنووکە بە باشترین شێوە کەڵك وەربگیردرێ، تــا بەم شێوە بتوانن بە بەشێك لە ئامانجــەکان بگــەن کــە لــە چوارچــێوەی ســتراتیژیی گــەورە و دوائامانجدا بەرنامەڕێژی کراوە. لە ڕاستیدا تاکتیك بریتییە لە بەشێکی پچووك لــەڕێکارەکان کە لە چوارچێوەی بەرنامەی سەرەکی و دایکدا هەیە و وەکو ستراتیژییەك لە دڵــی ســتراتیژیی گەورەدا جێی گرتووە. تاکتیکی کاتی دەبێ لەچوارچێوەی ســتراتیژیی کــاتی کــە ئــەویش لــە چوارچێوەی ستراتیژیی گەورەدا جێی گرتووە شرۆڤە و تاوتوێ بکرێ.

تاکتیکەکان لە ڕاستیدا بە هەڵسەنگاندن و سەروسامان دانی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی شێوازە دیاریکراوەکانی چالاکییەکەوە خەریك دەبن و ئەوەی کە چۆن بەڕێوە دەچن و ئەوەی کە گرووپ و یەکەکانی خەبات لە کاتێکی دیاریکراودا و لە بەرانبەر ئامانج و ئەرکی دیــاریکراودا چــۆن دەبێ کار بکەن.

تاکتیك بەبەراورد لەگەڵ ستراتیژیدا لە ئاستێکی خوارتردایە و بۆ قۆناغی زەمەنی کــورتتر و چوارچێوەی شوینگەیی بچووکتر_ بە ڕێژەی تاکەکان و گرووپگەل بچووکتر و ئامانجی کاتیی یان تێکەڵێك لەم هەل و مەرجانە بەکار دێت.

**شێوازەکان:** بــە واتــای هەڵبــژاردنی ئــامێر و شــێوازی بــە ڕێــوەبردنی هونــەری خــەباتی ناتوندوتیژییە کە خۆی بریتییە لە ڕێکارگەلێکی جیاجیا وەکــو شــێوە جۆراوجۆرەکــانی مــان گرتن، هاوکاری نەکردنی گروپی و دەستەیی و سیاسی و هتد.

داڕشتنی بەرنامەیەکی ڕێك و پێك و ئامانجدار و هەروەها گەشەی ئەو بەرنامەیە، بــۆ بــە ئاکام گەیشتنی ئامانج و ئایدیالەکان پێویستیی بە فۆرمۆڵەکردنی ڕێکوپێك و هەڵبژاردنی بە مشوورانەی:

ستراتیژیی دایك، ستراتیژیی کاتی، تاکتیکەکان و شێوازی باش هەیە.

## هێندێ لە توخمە سەرەكییەكانی خەباتی ناتوندوتیژی:

بۆ گەیشتن بە ئامانجەكانی خەبات، ستراتیژییەكی یەكسان نییە كە بتوانێ لە هەموو قۆناغەكاندا بە باشترین شێوە كار بكات. هەروەها هونەر و شێوازی هەڵبژێردراو بۆ خەبات، دەبێ كاردانەوەیەك بێ[(1)] بۆ گەشەی ستراتیژییە جیاجیاكان لە قۆناغە جیاوازەكان و هەل و مەرجە جیاجیاكانی خەبات. (لە راستیدا بەرنامەڕێژی لە خوارەوە بۆ سەرەوە و لە سەرەوە بۆ خوارەوەیە بەو واتایەی كە سەرەتا ستراتیژیی گەورە دیاری دەكرێ، بەدوای ئەودا ستراتیژییە كاتییەكان، تاكتیكەكان و پاشان شێوازەكان. دواجار دەكرێ لەسەر بنەمای میتۆدە هەڵبژێردراوەكان پێداچوونەوە بەسەر بەرنامەی ستراتیژیی كاتیدا بكرێ ). سەرەڕای ئەمە، لەوانەیە زۆرجار شێوازی خەباتی ناتوندوتیژیی پێویستی بە تێكەڵكردن وكردنەیەك بێت لەگەڵ ستراتیژیی گەورە بە كەڵك وەرگرتن لە رێكارەكانی دیكە.

ئەم خاڵە بەو مانایە نییە كە بۆ بە ئاكام گەیشتنی ئامانجەكانی خەباتی ناتوندوتیژی دەكرێ هەر هونەر و شێوازێك بەكار ببردرێت. بەڵكو بەم واتایەیە كە تاكتیكەكان لەسەر بنەمای بەرنامەی ستراتیژیك دیاری دەكرێن و لەسەر بنەمای تاكتیكەكانیش بەرنامەی ستراتیژیك پێداچوونەوەی بەسەردا دەكرێ. ( بۆنموونە ئەگەر لە قۆناغێك لە بەرنامەدا، شێوازی خەبات بە شێوەی توندوتیژانە بگۆڕدرێت، چییەتیی گشتیی ستراتیژی دەكەوێتە ژێر پرسیارەوە و دەبێتە هۆی رووخانی ژێرخانەكان و پڕۆسەگەلێك كە خەبات لەسەر بنەمای ئەوان كار دەكات، ئەم كارە لە باشترین دۆخدا دەبێتە هۆی كەمبوونەوەی كارامەیی و لە خراپترین حاڵەتیشدا رووبەڕووی شكست دەبێتەوە ). لەسەر ئەم بنەمایە، پاش پێداچوونەوە بەسەر بەرنامەی ستراتیژیكدا، دەكرێ شێوازە جۆراوجۆرەكانی وەك بانگەشە، راهێنانی گشتی، قبووڵكردنی داخوازی لایەنی بەرانبەر، وتووێژ و لە چەشنی ئەوان یان تێكەڵكردنی ئەوان لەگەڵ میتۆدەكانی گەمارۆی ئابووری بەمانگرتنە كرێكارییەكان لەجێی شێوازە هەنووكەییەكان دابنێین تا بكرێ بە باشترین شێوە بۆ بە ئاكام گەیشتنی ئامانجەكان هەنگاو هەڵبگیردرێتەوە.

بەرنامەڕێژی بۆ خەباتی ناتوندوتیژی زۆر بنەڕەتییە: "خەبات لەسەر بنەمایەكی بەرنامەداڕێژراو دەست پێ بكەن و درێژە بدەن و بە پشت بەستن بە تواناییەكانی خۆتان بە

---

(1) Feed Back.

سەرکەوتن هیوادار بن." ئەمە پەیامێك بوو کە (چارلز ئێستیێوارد پارنێل)[1] لەسەر بزووتنەوەی خەباتگێڕی گوندنشینانی ئیرلەندی ناردی کە بە شێوەی خۆبواردن لە بەکرێ گرتنی زەوی و زار لە ساڵەکانی ١٨٨٠-١٨٧٩ی زایینی خەباتیان کردبوو. " تەنیا پشت بە خۆتان ببەستن نەوە تاکێکی دیکە".

سەرنج و پابەندی بە بەرنامەڕێژی بۆ خەبات و دەستپێکردنی خەبات لەسەر ئەم بنەمایە، هۆکارێکی گرنگە بۆ راکێشانی یارمەتی و هاوکاریی ناتوندوتیژیی دیتران، بەلاّم ئەم سەرکەوتنە تەنیا و تەنیا لە چوارچێوەی پشت بەستن بە تواناییەکانی خۆ مەیسەر دەبێ. لەسەر بنەمای ئەم باوەڕە، ئەگەر دیتران لە هاوکاریکردن خۆیان پاراست، ئەگەر بێت و بەرنامەی ستراتیژیك بە دروستی رێکخرابێ، خەباتگێڕان شانسی سەرکەوتن لەدەست نادەن.

ئەگەر بێت و بەرپرسیارێتی دۆڕاندن و سەرکەوتن بدرێتە دیتران، ئەوکاتەی کە ئەوان لە هاوکاریکردن خۆببوێرن، خەبات شکست دەهێنێ. لە هەر حاڵدا لە خەباتگەلێکدا کە خەڵك و رێبەرانی بزووتنەوە تووشی بێ هیوایی و نائومێدیی دەروونی بن، شیمانەی ئەوە دەکرێ کە بەرپرسیارێتی بە هێزەکانی دەرەوەی خەبات بدرێ. خەباتی درووست و بەهێز ئەوەیە کە شکست و سەرکەوتنەکانی لە گرۆی کردەوەی خودی تاکەکاندا بێت و هەوڵ و تێکۆشانی ئەوان چارەنووسی خەبات دیاری بکات.

فۆرمۆڵەکردن و داڕشتنی بەرنامەیەکی ستراتیژیکی بەڕێوەبەری و لۆژیکییانە بۆ خەباتە نا توندوتیژانەکان، پێویستی بە تێگەیشتن و سەردەرهێنان لە تایبەتمەندییە بگۆڕەکان، دینامیزم ناسی و میکانیزمەکانی خەباتی ناتوندوتیژی هەیە.

سەرنجدان لەم خاڵە گرینگە کە هەموو بەرنامەکان، شێوازەکان و چالاکییەکانی خەبات دەبێ بژار بکرێن تا ئەو بەشە لە چالاکییەکان گەشە بکەن کە یارمەتیی سەرکەوتن و دەست گەیشتن بە ئامانجەکان دەدەن و ئەوانە وەلا بنرێن کە لەسەر بەرەوپێش چوون و بە ئاکام گەیشتنی خەبات کاریگەری نیگەتیڤیان هەیە.

هەروەها سەرنج بە فاکتەرەکانی دیکەش گرینگە" وەکو هۆکارە دەروونی، ئاکاری، جوگرافیایی و فیزیکی، کات دیاریکردن، رێژەی کەسەکان و پوتانسییەلێك کە بوونی هەیە، پێوەندیی نێوان ئامانج و چڕبوونەوەی هێز، پاراستنی پێشەنگی و دەسپێکەر بوون و سەرنجدان

(1) Charles Stewart Parnell

بەو بەشە لە شێوازەکانی چالاکی و خەبات کە زۆرتر دەبنە هۆی دەست گەیشتن بە ئامانجەکان و بە ئاکام گەیشتنی خەبات.

لێرەدا لەمە زیاتر لەسەر گرینگیی بەرنامەی ستراتیژیك لە خەباتە جەماوەرییەکاندا جەخت ناکەینەوە و تەنیا وەبیر دێنینەوە کە بەرنامەی ستراتیژیك، رەمزی سەرکەوتنی خەباتە کۆمەلایەتی و سیاسییەکانە. هەبوونی بەرنامەی ستراتیژیك بە واتای سەرکەوتنی لەسەداسەدی خەبات نییە، بەڵکو شیمانەی سەرکەوتن و بە ئاکام گەیشتنی هەموو، یان بەشێك لە ئامانجەکان زیاد دەکات.

## هەنگاوەکانی بەرنامەڕێژیی ستراتیژیك بۆ پێکهێنانی چاکسازی بە قازانجی جەماوەر لە رژێمە دەسەلاتخوازەکان

خەباتی بێ توندوتیژی، بریتییە لە شێوازی گەیشتن بە ئامانج بە کەڵك وەرگرتن لە شێوازە کۆمەلایەتی، دەروونی، ئابووری و سیاسییەکان، هاوڕێ لەگەڵ شێوازەکانی هاوکاری نەکردن وکەلێن سازکردن لەناو دەسەلاتدا.

ئەم شێوازە، میتۆدێکە لەسەر بنەمای بەکارهێنانی ئابووری، کۆمەلایەتی و سیاسی لە ئاقاری بە ئاکام گەیشتنی خواستە مرۆییەکان، بە بناغەدارشتنی توانای دەربڕینی دژایەتیی، خۆبواردن لە هاوکاری کردن، خەبات کردن و کەلێن نانەوە لە ریزەکانی دوژمندا. بەواتایەکی دی خەڵك خۆ لە بەڕێوەبردنی ئەو کارانە دەبوێرن کە دەبێ ئەنجامی بدەن و کارگەلێك بەڕێوە دەبەن کە قەدەغەیە.[(١)]

هەموو حکومەتەکان بۆ مانەوەی خۆیان پێویستیان بە پشتیوانی و هاوکاریی جەماوەر هەیە. کاتێك کە جەماوەر لەم هاوکاری کردنە خۆدەبوێرن، دەسەلاتداران بێ هیچ پەناگە و پاڵپشتێك دەڕوخێن. لە مێژووی مرۆڤایەتیدا شێوازە ناتوندوتیژییەکان لە زۆر بابەتدا بۆ بەرەنگاربوونەوەی چەوسانەوە و ستەم، دەسەلاتی سەرەڕۆکان، داکۆکی لە هەندێ لە بەهاکان و پەرەپێدان بە ئازادی بەکارهێنراون.

لە رابردوودا ئەم خەبات و بەرەنگاربوونەوانە، بەشێوەیەکی بەربلاو ئاکامی تێگەیشتنی راستەوخۆی جەماوەر، رووداوەکان ودژکردەوە خۆڕسکە جەماوەرییەکان بووە و خەڵك لە

---

(١) هەموو ئەم کارانە لەسەربناغەی خۆبواردن لەتوندوتیژی دامەزراون - و

ڕێگای خەباتدا، کەمتر ئامانجەکانیان بەشێوەی یەکجارەکی و روون دیاری دەکرد و بێ ئەوەی کە بەوردی بزانن کە چییان دەوێت، خەباتیان دەکرد. هێندێ لەم خەباتانە لە شێوازەکان، میتۆدەکان و بەرنامەڕێژیی تاکتیکی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان کەڵکیان وەرگرتووە، بەڵام ڕێژەیەکی زۆرکەم لەوان بۆ ڕێبەری کردنی خەبات لە ڕێگای گەیشتن بە ئامانجدا پێڕەوییان لە بەرنامە ستراتیژیکەکان کردووە. ئێستاکە گرووپە جەماوەرییەکانی سەرقاڵی خەبات، ناچار نین بۆ بەرنامەڕێژیی خەبات لە ئەلف و بێی سەرەتاییەوە دەست پێ بکەن وبە ئاسانی دەتوانن سەردانی شێوازە داڕێژراوەکانی ئەم خەباتانە بکەن. بە تێگەیشتنی قولتر لە شێوازەکانی خەبات، بە شەریك کردنی زانستی پێوەندیدار بەم میتۆدانەوە ، بە کەڵك وەرگرتن لە بەرنامەی ستراتیژیك و بەرنامەڕێژیی درێژخایەن_ کاردانەوەی خەباتە جەماوەرییەکان کاریگەرتر و کارامەتر دەبێ.

لە درێژەدا، ئەو هەنگاوە گرینگانە دەخرێنە بەرباس کە دەبێ لە بەرنامەی ستراتیژیکدا سەرنجیان پێ بدرێ:

### قۆناغی یەکەم: هەڵسەنگاندنی سەرەتایی و شرۆڤەکردنی بەرایی

* تاوتوێکردنی ناکۆکییەکان لە روانگەی هەردوو لاوە (خەڵك و دەسەڵات).

* ئامادەکردنی راپۆرتێکی تاوتوێ کراو بۆ هەڵسەنگاندی ئەو بارودۆخە کولتوری، سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتییانەی کە لەوڵاتدا لە ئارادان هاوکات لەگەڵ دابەشکردنی دانیشتوان.

* ئامادەکردنی لێکۆڵینەوە ستراتیژیکەکان، بەواتای دیاریکردنی لاوازی و توانای هەردوو لایەن، دیاری کردنی سەرچاوەکانی هێزی هەردوو لایەن و ئەو بنیاتگەلە کە پاڵپشت و پشتیوانیانن، شرۆڤەکردنی ئەو سەرچاوانەی کە لە دەست دەسەڵاتداران یان خەڵکدایە، پرسیار و توێژینەوە لەم باسەدا کە هەردوو لایەن لە چ بابەتێکدا بەیەکەوە بەستراونەتەوە و رادەی سەربەخۆییەك کە هەرلایەن لەلایەنی بەرانبەر هەیەتی و لە کۆتاییدا توانای خەباتگێڕی هەردوو لایەن.

* هەڵسەنگاندنی ئەم بابەتە کە کام یەك لەسەرچاوەکانی هێزی دەسەڵات شکێنەرترە و بۆ لاوازکردن و وەبەر ئامانجی هێرش دانان باشترە.

* دیاریکردنی رۆڵ و روانگەی کەسانی سێیەم (ولاّتەکان و رێکخراوە نێونەتەوەییەکان)و هەروەها گرووپ و رێکخراوە بیّ لایەنەکان.

* هەڵسەنگاندنی ئەو هۆکارە دەرەکییانە کە لەسەر رێکارەکانی خەبات کاریگەری دادەنێن" هۆکارە جوغرافیایی، ئاو و هەوا و بارودۆخی ناوچەیی، هۆکارە بنەڕەتییەکان وهتد.

* دیاریکردنی ئەو تەوژم(ئامراز)ی گوشارانە کە دەکریّ بۆ دیاریکردنی ئامانج و بە ئاکام گەیشتن کەڵکی لیّ وەرگرین.

* بابەت و هۆکارەکانی سەرەوە دەبیّ بەباشی تاوتویّ بکرێن تا بەم ئاکامە بگەین کە ئایا لە بارودۆخی هەنووکەدا دەکریّ لە قۆناغێکی زەمەنی دیاریکراودا بە ئامانج بگەی و ئایا دەست پێکردنی خەباتی ناتوندوتیژی ئاکامێکی دەبیّ یا نا. خەڵك دەبیّ تاوتوێی بکەن کە کام یەك لە هۆکارەکانی سەرەوە پایەدارن، کامیان بگۆڕن و لەدوو لایەن کامیان دەتوانن بەشێوەی راستەوخۆ لەسەر ئەم هۆکارانە کاریگەری دابنێن _ خەڵك یان دەسەلاّت.

**قۆناغی دووەم: بلاّوکردنەوەی ستراتیژی:**

رێبەرانی خەبات دەبیّ بۆ گەشە و بلاّوکردنەوەی ستراتیژیی گشتیی خەبات تیّ بکۆشن و لەپێش هەموو شتێکدا، ئامانجی سەرەکیی خەبات بە شێوەی رێکوپێك بە دەستەواژەگەلی روون دیاری بکەن و لەچوارچێوەی دەستەواژەگەلی گشتیدا لێکیان بدەنەوە کە خەباتی ناتوندوتیژی چۆن دەبیّ کار بکات تا بە ئاکام بگات. ئەم قۆناغە بە قۆناغی سەرەکی، بنەڕەتی و ریشەیی رێنوێنی کردنی خەبات و هاوئاهەنگی و خەت پێدان بە سەرچاوەکان بۆ بە ئاکام گەیشتن لە درێژ ماوەدا دێتە هەژمار.

ئایا تەنیا بە بەرنامەی کاتی، دەکریّ بە ئامانجی سەرەکیی خەبات گەیشت؟ لە حاڵێکدا نەکریّ، دەبیّ خەبات بە شێوەیەکی هەڵسەنگێنراو و رێك و پێك بە قۆناغگەلێکی جیاجیا دابەش بکریّ کە خاوەن وردەکاریی زیاتر و ئامانجگەلی پەیتاپەیتا و ریزبەندی کراوێك بن و لە راستیدا خەبات بە چەند قۆناغ دابەش بکریّ.

لەم قۆناغەدا بۆ هەرکام لەم قۆناغە جیاوازانە کە خاوەن ئامانجی کاتی و سنووردار بەلاّم لە چوارچێوەی ئامانجی گشتیدان، ستراتیژییەکی ناوازە(بژاردە) ئامادە بکریّ. لە راستیدا لەم قۆناغەدا چوارچێوەی خەبات کە بەر لەمە بەربلاّوتر بوو، بۆ چەند قۆناغی خەباتکارانە دابەش

دەبێ کە هەرکامیان تایبەتمەندی و ستراتیژیی خۆیان هەیە. ڕێبەرانی خەبات دەبێ کات، شوێن، چۆنیەتی و ئەوکەسانەی خەبات دەکەن بە شێوەی ڕێك و پێك و روون بە ناوبردنی وردەکارییەکان روون بکەنەوە.

لەم قۆناغەدا ڕێبەران دەبێ ئەو تاکتیکە کاتییانە و شێوازە بژاردەکان هەڵبژێرن کە یارمەتیی بە بە ئاکام گەیشتنی ستراتیژییەکان دەدەن. سەرنجدان لەم خاڵە گرینگە کە هەڵبژاردنی ئەم تاکتیك و میتۆدانە دەبێ لە چوارچێوەی بەرنامەیەکی ستراتیژیکدا بێت و ئەم هەڵبژاردنەش تەنیا پاش دیاری کردنی ستراتیژیی دایك بەڕێوە بچێت. هەڵبژاردنی شێوازەکانی خەباتی ناتوندوتیژی دەتوانێ هەڵگری شێوازەکانی مانگرتن، ناڕەزایەتی، رازی کردن و دەست تێوەردان بێت کە لە هەل و مەرجی جیاجیادا بەسەرنجدان بە بەرنامەی ستراتیژیك، ئامانج، لێکدانەوەی ستراتیژیك و هەروەها ژێر بەرنامەی خەباتگێڕانەی هێندێ لەم شێوازانە، لە ئەوانی دی باشتر کار دەکەن. بەتایبەتی ئەوەکە هێندێ لەم ڕێگەچارانە کاردانەوەیەکی زۆر باشیان لە سنووردارکردن و زەبرلێدان لە بەرژەوەندیی هێزی رژێمدا هەیە.

ڕێبەرانی خەبات دەبێ دڵنیا بنەوە کە بەرنامەی ستراتیژیکی دەست نیشان کراو لەگەڵ ئامانجەکانی خەبات، جۆری تەوژمی گوشار و جۆری تاکتیك و میتۆدەکاندا تەباییان هەیە.

### قۆناغی سێیەم: تواناسازی

ڕێبەرانی خەبات دەبێ دڵنیا بن لە توانای جەماوەر وەك بەڕێوەبەرانی خەبات، لە بەڕێوەبردنی بەرنامەی ستراتیژیك. چونکوو ئەگەر جەماوەر لێهاتوویی و توانای بە ئاکام گەیشتنی بەرنامە و ستراتیژیی ڕێك و پێككراویان نەبێت، پرسیار و توێژینەوە بۆ بەدەستهێنانی شێوازگەلێك بۆ زیاترکردنی توانای جەماوەر پێویستییەکی حاشا هەڵنەگرە و ئەگەر ڕێگە چارەیەکی وا لەبەردەستدا نەبێت، ئەوە دەبێ بەرنامەی ستراتیژیك چاك بکرێتەوە.

پێویستە ڕێبەران توانایی ئەو بنیات و ڕێکخراوانە کە لە دەرەوەی دەسەڵاتدان بەهێز بکەن، بەتایبەتی ئەگەر بەرنامەی ستراتیژیك لەسەر بنەمای هاوکاری و بەشداریی ئەم بنیاتانە لە مانگرتنەکان و دەربڕینی دژایەتییەکان داڕێژرابێت.

پێویستە ڕێبەرانی خەبات بۆ راکێشانی بەشداری و بەهرەمەندبوون لە پشتیوانی هێزەکانی سێهەم بەرنامەڕێژی بکەن، بەڵام نابێ بەتەواوی پشت ئەستوور بن پێیان.

### قۆناغی چوارەم: دەسپێکی خەبات

لەم قۆناغەدا رێبەرانی خەبات پێویستە:

* لەسەر تواناکانی هێزە جەماوەرییەکان و لاوازی دەسەلاٚت لە چوارچێوەی بەرنامەی ستراتیژیکی گەورە، ستراتیژیگەلی ئاست خوارتر و میتۆدەکانی خەبات چڕبنەوە، بەتایبەت ئەوانەی کە دەبنە هۆی سنووردارکردن و تێکشکاندنی سەرچاوەکانی هێزی دەسەلاٚت.

* لە کردەیی بوونی بەرنامەی ستراتیژیك لە چوارچێوەیەکی رێکوپێك و رێکخراودا کە دوور بێت لە هەر جۆرە توندوتیژییەك دلٚنیا بنەوە، چونکوو پشت بەستن بە شێوازی توندوتیژانە دەبێتە هۆی لاوازیی هێزە جەماوەرییەکان.

* هەروەها لەم بابەتە دلٚنیا بنەوە کە چالاکییەکانی بەرنامەی ستراتیژیك ئازادیی کردەیی بێ کەم و زیاد بۆ خەبات دەداتە جەماوەر ( لە راستیدا بەرنامەی ستراتیژیك دەبێ لێهاتوویی سپاردنی دەسەلاٚتی ببێ).

دلٚنیابنەوە کە هێزە جەماوەرییەکان دەستیان دەگاتە سەرچاوە هەستیار و گرینگەکان.

* بەرنامەیەکی رێکوپێکیان بۆ شێواندنی هاوسەنگی و بارتەقایی هێزەکان لە بەرەی دەسەلاٚتدا هەبێت.

* وێڕای بەرگری لە خۆیان لە بەرانبەر سەرکوتکارییەکانی دەسەلاٚتدا، بە رەوتی خەبات لەسەر بنەمای شێوازە هەلٚبژێردراوەکان درێژە بدەن و لەژێر کارتێکەریی سەرکوتکارییەکاندا، میتۆدی خەبات نەگۆڕن.

* زیاتر لەوە کە دژکردەوە لە خۆیان نیشان بدەن، توانای دەسپێشخەرییان لە کردەوەدا هەبێ. بەردەوام لە خەباتدا پێشەنگ بن، توانایی دژکردەوەی خێرایان هەبێ و لە جێگرتن و نەبزووتن خۆ بپارێزن. پێویستە خەبات لەسەر بنەمای بەرنامە و میتۆدە جەماوەرییەکان بچێتە پێشەوە نەك لەسەر بنەمای شێوازی دەسەلاٚتداران.

* بەشێوەی بەردەوام رادەی بەرەوپێشچوونی خەبات لەگەلٚ بەرنامەی ستراتیژیکی لە پێشدا دانراو هەلٚسەنگێنن.

### قۆناغی پێنجەم: ئاکامی خەبات

* سەرکەوتن، شکست یان گەیشتن بە هێندێ لە ئامانجەکان؟

* لە ئەگەری سەرنەکەوتندا، تاوتویٚ کردنی ریٚکوپیکی خەبات و ئەو شتەی کە بەریٚوە چووە و دارشتنی بەرنامەیەکی نویٚ لەسەر بنەمای وانە و ئەزموونە فیٚربووەکان، بۆ ریٚکخستنەوەی سەرلەنویٚ پیٚویستە.

## رۆڵی ریٚبەری لە چاکسازییەکاندا:

ئەو (کاتالیزۆر)[*]ەی کە شیٚوازەکانی خەباتی ناتوندوتیژیی جەماوەریی لە حاڵەتی تیۆری و بەرنامەوە کردەیی دەکاتەوە، ریٚبەرییە. ریٚبەران لە ریٚی خەبات بۆ دەست گەیشتن بە دیموکراسی، ئەرکی جۆراوجۆریان لەسەرشانە" کۆکردنەوەی هیٚزە جەماوەرییەکان، روونکردنەوەی ئەرك و شیٚوازی کردەوەی خەڵك،[1] ورەدان بە خەڵك، ئەو کاتەی کە سەبارەت بە سەرکەوتن بیٚ هیوا بوونە یان کەوتونەتە گومانەوە، بریاردان لە بارودۆخی قەیراناویدا، یەکگرتوویی خەڵك و راگرتنی ورەی هاوکاری بۆ دەست گەیشتن بە سەرکەوتن.

لەم سەردەمەدا کە سەردەمی گەمەی سیاسی و ویٚنە گەرایی(ئیماژیسم)ە خەیاڵییەکان و رزگاریدەرە درۆزنە سیاسەت بازەکانە، خەڵك سەبارەت بە ریٚبەرانی سیاسی تا رادەیەکی زۆر بەگومانن وبەراستی پرسیار دەکەن کە ئایا ئەم کەسانەی کە بەئیددیعای ریٚبەرایەتیی خەڵك، خەریکی کایە کردن بە وشەکان وپیشاندانی داهاتوویەکی روونن، بەراستی خۆیان بەو شتەی کە دەیلیٚن باوەریان هەیە و بەراستی وتەکانیان دەرخەری کەسایەتیی ئەوانە. زۆربەی خەڵك حەپەساو و دڵشکاو لە فیٚڵبازیی دیکتاتۆرگەلیٚکن کە لەژیٚر پۆشەنی دیموکراسی و ئازادیدا خەریکی راکیٚشانی سەرنجی خەڵك بوونە و هەرکە دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرتووە، تیٚغی سەرەرۆییان دەرهیٚناوە. ئەمرۆ باوەری خەڵك ئەمەیە، کە ئەوشتەی کە ئاکامی هەڵبژاردنەکان دیاری دەکات ئەو پارە و سەرمایەیە کە لەم ریٚگایەدا خەرج دەکریٚ، نەك کەسایەتی، روانگەی سیاسی و لیٚهاتوویی پاڵیٚوراوەکان. ئەگەر ئەم ویٚنە کە خەڵك لە سیاسەتمەدارەکان هەیانە،

---

(*) ماددەیەکی کیمیاییە کە خیٚرایی کاردانەوە کیمیاییەکان زیاد دەکات و خۆشی لەکۆتاییدا هەر وەك خۆی دەمیٚنیٚتەوە. ئامرازیٚکی ئاسانکەرە.

(١) لەوەرگیٚراندا لەباتی وشەی خەباتگیٚران لەخەڵك کەڵکوەرگیراوە، بەم هۆیەوە کە جیٚگیربوونی دیمۆکراسی لەسەر داخوازیو بەشداریی خەڵك بەئەنجام دەگاتو لەراستیدا هیٚزەکانی خەبات خودی خەڵکن، نەگرووپ یان حیزبیٚکی تایبەت _ و.

راست بێت، کاری ڕێبەران لە کۆکردنەوەی خەڵك لە خەباتەکاندا زۆر ئەستەم دەبێت، چونکوو پێویستە بەبوونی ئەم تێگەیشتنە، ڕاستێتی و هەقانەتی خۆیان بسەلمێنن. هەڵبەت لە نێوان سیاسەتوانانەدا کەسانێك هەن کە لە بیر و زەینی خەڵکدا وێنەیەکی جیاوازتریان بە نیسبەت سیاسەتوانەکانی دیکەوە هەیە، وەکو نێلسۆن ماندێلا لە ئافریقای باشوور، مارتین لوسەرکینگ لە ئەمریکا، لۆخ والێسا لە پۆلەندا و ئونگ سان سوکی لە بۆرما. ئەم ڕێبەرانە نموونەگەلێکی بەرچاو و دەگمەن لە ڕێبەرانی نەتەوەیین کە لە سیاسەتوانەکانی دیکە و وێنەیەك کە خەڵك لەوان لە زەینیاندا هەیانە، زۆر جیاوازن.

کاتێك کە مەودای نێوان دەسەڵاتداران وخەڵك تا ئەو ڕادە زیاد دەبێت کە خەڵك ئیتر ناتوانن هیچ چاودێرییەکیان لەسەر کردەوە و سیاسەتەکانی ئەوان ببێ، چاکسازی خوازانێك کە بەدوای دامەزراندنی سیستەمی "دیمۆکراتیك"ەوەن، لە دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەك بۆ کۆکردنەوەی جەماوەر لە بەرانبەر سیاسەتەکانی دەسەڵاتدا لە هەوڵدان. لەم بارودۆخەدایە کە ڕۆڵی ڕێبەران گرنگی بەدەست دێنێت، چونکوو ئەوانن کە پێویستە باوەڕبەخۆبوون و هەستی سەرکەوتن ببەنە ناو خەڵکەوە و ئەوان بە یەکگرتن ویەکێتی لەپێناو بەدەستهێنانی مافە سیاسییەکانی خۆیان و پێکهێنانی هاوسەنگی لە سیاسەتەکانی دەسەڵاتدا بانگهێشت بکەن. هەروەها ڕێبەران پێویستە خەڵك لەم بابەتە تێ بگەیەنن کە ئەم خەباتە لەپێناو دەست گەیشتنی هەموانە بە مافەکانی خۆیان و جێگیرکردنی دادپەروەری.

ڕێبەرانی سەرکەوتوو و کاریگەر کە لە گێرە و کێشە نەتەوەیی یان ناوچەیی، نیزامی یان لە نێوان خەڵکی ئاساییدا بە باشی توانیویانە خەباتەکە ڕێبەری بکەن، خاوەن تایبەتمەندییەکی ڕوون و دیارن. ئەگەرچی باوەڕی باو ئەمەیە کە ڕێبەرانی سەرکەوتوو ڕێبەرانێکن کە بە شێوەی زکماکی، تایبەتمەندیی ڕێبەرایەتییان هەیە، بەڵام ئەمڕۆ ئاشکرا کراوە کە زۆربەی توانایی ڕێبەران بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کێشە و گرفتەکان، لە ڕێگای ڕاهێنان، خوێندەواری و ئەزموونەوە بەدەست دێت.

خەباتی ستراتیژیکی جەماوەری پێویستیی بەم کارەیە کە هەزاران کەس لە خەڵك، ئەگەر نەڵێین ملیۆنان کەس، بە شایستەیی و لێزانی ڕێبەرانی خۆیان باوەڕیان هەبێ. ئەم مەسەلە یەکێك لە پێویستییەکانی سەرکەوتنی خەڵك لە بەرانبەر ڕژێمە دەس درێژیکەرەکاندایە. لە درێژەدا تایبەتمەندییە پێویستییەکانی ڕێبەران، بۆ ڕێنوێنی و بەهێزکردنی خەبات، تاوتوێ کراون:

## تایبەتمەندییەکانی ڕێبەران:

## ڕێبەران سەرمەشقی شوێنکەوتووەکانیانن:

ئەم بابەتە سەلمێندراوە کە هەر ڕێکخراوێك دەرخەری تایبەتمەندی و خەسڵەتەکانی ڕێبەرانی ئەو ڕێکخراوەیە. ئەو ڕێبەرەی کە لە پێگەی ئیداری و ڕێکخراوەیی خۆی بۆ بەدەسهێنانی بەرژەوەندیی تاکەکەسی سوود وەردەگرێت، نابێ چاوەڕوانی ئەوەی هەبێ کە هەرکام لە ئەندامانی کۆمەڵەکەی شێوازێکی جیا لەمەیان هەبێ. کاتێك ڕێبەرەکان خۆیان تووشی گەندەڵی تاکەکەسی دەبن، گەندەڵی ڕێکخراوەکەش پارێزهەڵنەگر(حەتمی)ە. کاتێك ڕێبەران راستبێژی، فرەکۆشیاری، بوێری و ڕێزی بەرانبەر دەکەنە پیشەی خۆیان، شوێنکەوتووانیشیان هەر بەم شێوە هەڵسوکەوت دەکەن. بەکورتی دەتوانین بڵێین خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی ڕێکخراوێك، دروسکراو و سەرمەشق گیراوە لە ڕەوشت و ئاکاری ڕێبەرانی ئەو ڕێکخراوەیە. لەپێوەندی لەگەڵ خەباتی جەماوەریشدا هەر بەو جۆرەیە، ئەو خەباتانەی کە خاوەن ڕێبەرایەتییەکی راستبێژ، جەماوەریی و وەفادار بە ئارمانجەکانن، شوێنکەوتەکانی ئەوانیش ئەمەگناسی و خۆڕاگری دەکەنە پیشەی خۆیان. ڕەنگە بەرچاوترین نموونەیەك کە دەتوانین وەکو کاریگەریی ڕێبەران لەسەر پێڕەوەکانیان دەستنیشانی کەین، دوو وڵاتی هێند و پاکستانە. خەڵکانی ئەم دوو وڵاتە لە بنەڕەتدا یەك نەتەوە بوون، پاش جیابوونەوەی هێند و پاکستان، دابونەریتێکی جیاوازیان گرتە بەر. هێند رووی هێنایە دیموکراسی و بەدەستهێنانی باوەڕ و رای نێونەتەوەیی و پاکستانیش هەر ڕۆژە شایەتحاڵی کودەتایەکی نوێ و قەیرانێکی نوێ، دتوانین بڵێین ئەمە لە شێوەی بیرکردنەوەی جیاوازی گاندی وەك ڕێبەری شۆڕشگێڕی هێند و ڕێبەرانی پاکستانەوە سەرچاوەی گرتووە. خەڵکی هێند بەو ڕەوتەدا کە لەسەر بنەمای مرۆڤ ویستی و یەکترقبوولکردن و هەڵکردن بنیات نرابوو، هەنگاویان نا و، خەڵکی پاکستانیش بەدوای دەمارگرژی و چەقبەستوویی ڕێبەرانی خۆیان.

## ڕێبەران و تێگەیشتنی ئەوان لە پێڕەوانیان:

هەر ڕێبەرێك دەبێ ناسیاوییەكی باش و گشتی لەو كەسانە هەبێت كە دەیەوێ لە ڕەوتی خەباتدا ڕێبەرییان كات. لە ئاستی نەتەوییدا ئەم بابەتە بریتییە لە هەڵسەنگاندنی دابەشینی جەماوەر، ڕادەی ئاستی داهات (كرێكاران، وەرزێران، مامۆستایان و هتد)، ڕادەی قازانج، بیروباوەڕە ئایینییەكان، جۆراوجۆریی قەومی و نەژادی، سەرچاوەی داهات، هەناردە و هاوردەی خۆماڵی و هەرێمی، ڕادەی بەرهەمهێنانی پاڵێوراوی ناوخۆیی (GDP)، ئەندازەی دەست گەیشتن و ڕادەی پاك و خاوێنی و دەرمان و خزمەتگوزارییە كۆمەڵایەتییەكانی دیكە.

خاڵێكی دیكەی جێی سەرنج ئەوەیە كە، ڕێبەرەكان بەم پرسیارە وەڵام بدەنەوە كە خەڵك ڕۆژگار(ژیان)ی خۆیان چۆن بەسەر دەبەن. بۆنموونە لەساڵی٢٠٠٢ی زایینی خەڵك لە وڵاتی زیمبابۆی ڕۆژانە چەندین سەعاتیان بۆ وەرگرتنی خۆراك بەپێی سەرە، لە سەرەدا(ریز) دەبردە سەر و هەروەها ٢٥٪ لە خەڵك بە نەخۆشی ئایدز (h.i.v) گیرۆدەبوون و هەڵاوسانی ئابووری لەساڵدا بە١٠٠٪ دەگەیشت و نرخی بێكاری ٧٠٪ بوو.

ڕاستیی ژیانی خەڵك ئەمە بوو كە ئەوان هیچ داهاتێكی تایبەتییان نەبوو و زۆربەیان تووشی بەدخۆراكی بوون. گەڕان بەدوای خۆراك و چاودێری لە نەخۆشەكان و مردنی ئەندامانی بنەماڵە بە هۆی فەقیری و بێ خۆراكی، بە شێوەیەك خەڵكی سەرقاڵ كردبوو كە هیچ كاتیان بۆ بیركردنەوە لە بابەتی سیاسی نەمابوویەوە. ئەگەر باروودۆخ بەم خراپییە كارەساتبار نەبوایە، ڕژێم نەیدەتوانی بە بەلاڕێدابردنی بیروڕای نێونەتەوەیی بەم مەسەلانەوە، گوشار و سەركوتی دژەمرۆیی بەسەر دژبەرانی سیاسی و بنەماڵەكانیاندا بەكار بێنێت. بڕینی جیرەی خۆراكی، كەڵك وەرگرتن لە بەكرێگیراوانی مرۆڤ كوژ بۆ كوشتن و دەستدرێژیی سێكسی لە خەباتگێڕانی سیاسی و بنەماڵەكانیان، نموگەلێك بوون لەسەركوتی دژە مرۆیی و بێ حەیایی ڕژێمی ئەم وڵاتە.

بەرنامەیەك كە ڕێبەران بۆ ڕۆڵی جەماوەر لە خەباتدا لە بەرچاوی دەگرن پێویستە لەگەڵ ڕاستییەكانی ژیانی ڕۆژانەی ئەواندا بێتەوە.

بۆ ڕێبەرە كۆمەڵایەتییەكان، هەر تاكێكی تێكەڵ بە خەبات، پێویستە خاوەن ناو و ناوبانگ بێت. ئەوان دەبێ لەسەر بنەمای بەرنامەگەلێكی ڕوون و ماوە بە ماوە، لەگەڵ

خەڵکدا دیدار و دانیشتنیان هەبێ و سەرەڕای ئاڵوگۆڕی بیروڕاکان، پیشانیان بدەن کە ئامانجی سەرەکیی ئەوان لە خەبات، بەدەستهێنانی مافەکانی خەڵکە. تەنیا ئەوە کە ڕێبەران جارناجار وەبیر خەڵك بێننەوە کە بارودۆخی ژیان لە حکومەتی دیموکراتیکدا چۆن چاکتر دەبێت بەس نییە، ڕێگەچارەی باشتر بۆ پێوەندیی نزیك لەگەڵ خەڵکدا ئەمەیە کە ڕێبەران خۆیان، لە چارەسەرکردنی کێشە و گیروگرفتەکانی خەڵکدا بەشداری بکەن.[1]

**ڕێبەران دەبێ لە چوارچێوەی ئەرکەکانی خۆیاندا شارەزا بن:**

لە گەرماوگەرمی خەباتدا، هیچ هۆکارێك ناتوانێت، بەرادەی ناکارامەیی و نەشیاوی ڕێبەر ببێتە هۆی شکست و داڕمانی ورەی خەڵك.

بڕیارگەلی نابەجێ دەبێتە هۆی مەترسی و زیانگەلی ناکاریگەر و قەرەبوونەکراو، ڕاستبێژی و بەڵێن لەناو دەبات و ترس و دڵەراوکێ لەسەر یەك بەیەکی تاکەکانی خەبات زاڵ دەبێ.

خەڵك لەم ڕوانگەوە سەیری ڕێبەران دەکەن کە ئەوان توانای سەرکەوتنیان لە گۆڕەپانی ململانێدا هەیە" ئێستا ئەم گۆڕەپانی ململانێیە گۆڕەپانێکی باوی شەڕ بێ یان گۆڕەپانی خەباتی ناتوندوتیژی. هەربۆیە تەنانەت ئەوانەی کە زانست و پسپۆڕیی ئەم کارەشیان هەیە، دەبێ سەرنجی ئەم خاڵە بدەن کە سەرکەوتن لەم گۆڕەپانەدا لە گرۆی لەبەرچاوگرتنی هاوکێشە گەلێکی زۆردایە.

لە ئاستی خەباتی نەتەوەییدا، دەبێ ڕێبەران لە یەکەمین هەنگاودا ئەو توانایەیان هەبێ کە بە ڕوونی هۆی ئەو خەباتکردنە شرۆڤە کەن و هەروەها بتوانن لە ڕێگای وتن و ئاکاری خۆیانەوە بە کاریگەریی مەعنەوی و ڕۆحی، خەڵك بۆ بەشداری لە خەباتدا هان بدەن. هەنگاوی دیکە ئەمەیە کە چۆنیەتی ڕاکێشانی پشتیوانی هێزە نێونەتەوەییەکان تاوتوێ بکەن و وێڕای سوود وەرگرتن لە سەرچاوە جیاجیاکان، خەبات بە شێوەیەك ڕێنوێنی بکەن کە کەمترین زیانی لێ بکەوێتەوە.

ڕێبەرانی خەبات دەبێ:

* توانایی شرۆڤە و تاوتوێکردنی بارودۆخەکەیان هەبێ.

---

(١) بۆنموونە مەهاتما گاندی لەگەرەکە هەژارنشینەکانی ناسراو بە گڵاوەکانو لەناو ئەواندا ژیانی دەکرد. و

* میتۆدەکانی خەباتی  ناتوندوتیژی پاش تاوتوێکردنی بارودۆخەکە بەباشی هەڵبژێرن.

* بەرنامەی خەباتی  ناتوندوتیژی بۆ بەکاربردنی شێوازەکان ئامادە بکەن.

* بەشداربوانی خەبات بۆ چۆنیەتی کەڵك وەرگرتن لەم شێوازگەلە و بەجێگەیاندنی بەرنامەکان رابێنن.

## بەرپرسیارێتی ناسی و هەست بە بەپرسیارێتی کردن:

وادیارە راکردن و خۆدزینەوە لەژێر باری بەرپرسایەتی، یەکێك لە تایبەتمەندییە کەسێتییەکانی تاکەکانی سەردەمی ئێمەیە. بۆنموونە، کاتێك ئێوە لەگەڵ کۆمپانیایەکی خزمەتگوزارییەکانی دوای فرۆش بۆ وتنی کێشەی ئامێرە کڕدراوەکە پێوەندی دەکەن، جیا لەوە کە کەم و کوڕی دەزگاکە چییە، گرینگترین پێشینە(ئەولەوییەت)ی ئەو کۆمپانیانە، سەلماندنی ئەم بابەتەیە کە ئەو کێشەیەی کە پێش هاتووە پێوەندی بەوانەوە نییە. نموونەیەکی دی خوێندکارێکە کە لە ئەزموونەکاندا سەرنەکەوتووە. ئەو لە یەکەم کاردانەوەدا ماموستاکەی بە هۆکاری سەرەکی سەرنەکەوتنی خۆی دەزانێ.[1] رێبەرانی سیاسیش هەربەم شێوە هەڵسوکەوت دەکەن، ئەوان بەردەوام بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بڕیارەکانی ئەوان لەسەر بنەمای ئەو زانیارییانەی لەبەردەستدایە وەرگیراوە و ناوەرۆکەکەی دروستە، بەلاّم بەهۆی بارودۆخ و گیروگرفتێك کە هەیە ئاکامی نەبووە. کەوابوو بەوئاکامە دەگەن کە هیچ هەڵەیەك لەوانەوە سەری هەڵنەداوە. رێبەرانی نەشیاویش وەکو هێندێ لە خەڵك، هەڵەکانی خۆیان دەخەنە ئەستۆی بارودۆخەوە، هەروا کە زۆرێك لە خەڵك وەدرەنگ کەوتنی ئامادەبوونی خۆیان لە دانیشتنەکاندا بەبیانووی جۆراوجۆری وەك نەبوونی کاتی پێویست، کارگەلی گرنگی دیکە، کیشەگەلی بنەماڵەیی (نەخۆشی مندالاَن، کۆبوونەوەی باوك و دایکان وهتد) پاساو دێننەوە، رێبەرانی دۆڕاویش دەستەوداوێنی پاساوهێنانەوەی درۆ و ساختە دەبن. کەڵك وەرگرتن لەم باوەڕە کۆن و عەوامانە کە " ئەگەر سەرنەکەوتین هۆی ئەمە بوو کە خوا نەیویست" شێوەیەکی باوە. بەدڵنیاییەوە رێبەرانی خەبات کەسانێکی ئاسایی نین و

---

(١) باشترین وێنە دەسەڵاتدارانی ناکارامەن کە هەمیشە گرفتە هەنووکەییەکان بۆ دەسەڵاتدارانی پێش خۆیان (پێشینەکان) یان کارشکێنی دیتران دەگەرێننەوە - و.

خەباتیش کارێکی ئاسایی و هەمیشەیی نییە، کەوابوو بۆ بیٚتـاوان نیشـاندانی خـۆ و پاساوهێنانەوە بۆ کردەوە هەڵەکان، نابیٚ پشت لە راستییەکان بکەین.

رێبەرێکی شیاو بەرپرسیارێتی شکست لەئەستۆ دەگریٚ و ئەگەر لەهێندیٚ بابەتـدا هەڵەیەك رووی دابێت، سەرکۆنەی دیتران ناکات" رێبەری راستەقینە کاتێك بڕیارەکانی ئاکامی نگەتیڤی لیٚ بکەوێتەوە، بەرپرسایەتییەکەی لە ئەستۆ دەگرێت، وانەی لیٚ فێر دەبێت و قەرەبووی هەڵەکان دەکاتەوە.[1] لە بەرانبەر رێبەرانێکی وادا، خەڵکیش دەبیٚ بەهۆی بوێری ئەوان لە بەئەستۆ گرتنی هەڵەکانیان ئەمەگناسییان بکەن. قبووڵکردنی هەڵە یەکەمین هەنگاوە بۆ قەرەبوو کردنەوەی. " هاورێیان و هاوسەنگەران ببینن، من هەڵەی خۆم قبووڵ دەکەم، من لە بەدواداچوونی ئامانجەکانـدا بـەهۆی وردنەبوونـەوەی باش و چاودێری نەکردن شکستم خوارد. بەلاٚم ئەمڕۆ بڕیارم داوە کە ئیتر لە داهاتوودا هەڵەیەکی وا نەکەم. ئێمە دەبیٚ لە بیری رێگاچارەیەك بۆ پێشگرتن لە هەڵەیەکی لـەم چەشنە لەداهاتوودا بین."

رێبەرانی نەشیاو ئاسانترین ریگاکان بۆ کوژاندنـەوەی ئـاگری لۆمەکردنـەکان هـەڵ دەبژێرن کە، وەپاڵدانی هەڵەکان بە ژێردەستەکان و پێڕەوانیانە. لە حاڵێکدا رێبـەرانی شیاو و کارامە بە قبووڵکردنی شکسـت، قبـووڵ دەکـەن کـە سـەرنەکەوتن لەخـەباتی ناتوندوتیژیدا لەهێندیٚ بابەتدا حەتمییە و هیچ کەس لە خەتاو هەڵە بەدوور نییە.

تەنیا کەسانێك شیاوی لێبووردن و لێخۆش بـوون نـین کـە لـە هەڵـەکانی رابـردوو ئەزموون وەرناگرن و رێگا پێوراوەکان دووبارە تاقیدەکەنەوە .

## کەسایەتی دان بە شوێنکەوتوان:

رێبەرێکی لێهاتوو کاتێك باس لە سەرکەوتنەکان و بەختەوەرییەکان دەکات، کەمتر لەوشەی"من" کەڵکوەردەگریٚ و لە بری ئەوە، لە وشـەی "ئێمـە"و ئەگـەر کەسـێکی تایبەت ئەنجامی دابێت لەوشەی "ئەو" کەڵکوەردەگریٚ، تا بەم شێوە بە هاوسەنگەرانی

---

(١) ئەم مەسەلە تەنیا لەبارەی رێبەرانەوە راست نییە، خەڵکیش دەبیٚ کردەوەی خۆیان هەڵسەنگێنن. ئایا بە تێپەڕبوونی نیوسەدە لەبەنەتەوەیی کردنی پیشەسازی نەوت ئێمە ئیرانییەکان کـردەوەی خۆمـانو ئـەوەی کـە لەگەڵ حکوومەتی دوکتور موسەدقدا کردمان هەڵسەنگاندووە یا هێشتا ئیستیعمارو دەستێوەردانی بێگانەکان (و هێندیٚ جاریش کارگێڕی ئەو کەسایەتییە گەورە) بە هۆکاری شکست دەزانین- و.

خۆی کەسایەتی و پرستیژ بدات. ئەو بەم کارەی ئەوە وەبیر دێنێتەوە کە سەرکەوتن ئاکامی هەوڵ و تێکۆشانی هەمووان بووە.

دەبێ لە هەموو کەس ئەمەگناسی بکرێت، منداڵێك کە هێرشی هێزە دژە شۆڕشەکانی راپۆرت داوە، پیرەژنێك کە ئاوی داوەتە خۆپیشاندەران، کچێکی لاو کە بە زەوقی خۆی راگەیەندراوەکانی گەڵاڵە کردووە و پیاوێك کە بە وەمەترسی خستنی گیانی خۆی راگەیەندراوەکانی بلاّو کردۆتەوە، رێبەرانێك کە بەرنامەی خەباتیان دارِشتووە و ئەوانەی کە ئەم بەرنامانەیان بەئەنجام گەیاندووە. هەموو ئەم کەسانە دەبێ دڵگەرم بکرێن، گرنگی کار و رۆڵیان لە رێگەی سەرکەوتندا، وەبیریان بێننەوە.

لەوانەیە رێبەرێك وریاترین وکەم وێنەترین تاکی دونیا بێ، بەلاّم هەموو بلیمەتی و لێهاتووییەکانی بە بێ کردەیی کردنی ئەندێشەکان و داهێنەرییەکانی لەلایەن خەڵك و شوێنکەوتووانی خەباتەوە، لەنێو دەچن. نرخ دانان و بایەخ پێدان بە کردەوەی تاکەکان، دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەوان پاڵنەرێکی زێدەتر بەدەست بێنن، بەم باوەڕە دەگەن کە بوونیان بۆ سەرکەوتن گرینگە، خەبات پێویستی بە بەشداریی ئەوانە و لە هەوڵ و تێکۆشانی ئەوان ئەمەگناسی دەکرێت. تەنیا رێبەرانی سەرەڕۆ و خۆبەزل زانن کە سەرکەوتن بە ئاکامی کردەوەی خۆیان دەزانن و وەك موریدێك سەیری شوێنکەوتوانیان دەکەن، کە تەنیا دەبێ بەدوای دەستوورەکانی ئەوانەوە بن.

## وەفاداری:

لە کۆمەڵگای دیموکراتیکدا، بە ئاکام گەیشتنی وەفاداری بە واتا نەریتییەکەی و لەسەر بنەمای گوێڕایەڵی بێ ئەملاو ئەولا، ئاسان نییە. وەفاداری بەوێنەی شەقامێکی دوو سایدییە کە لە بەرێکیەوە خەڵکانێك هەن کە دەبێ بە ئارمانج و رێبەرەکانیان وەفادار بن و لەو بەرەکەی دیکەشەوە رێبەرانێك هەن کە دەبێ لە بیری سەرکەوتنی خەبات و بە ئاکام گەیشتنی داخوازییەکانی خەڵکدا بن. وەفاداری بە واتای بەڵێ_ قوربان گوتن وهەر بڕیارێك بە بێ گومان و پرسیارکردن بەڕێوەبردن نییە. لە ڕاستیدا قبووڵکردنی فەرمان و دەستوورەکان بەبێ هەڵسەنگاندن ولێ پرسینەوە راست بەمانای خەیانەتە. ئەوەی کە شوێنکەوتوان و خەڵك هەر کردەوەیەکی رێبەران بە رەوا بزانن و

هەموو کارەکانیان بەباش بزانن، زەبرێکی مەرگ هێنەر لەجەستەی خـەبات دەدات.[1] وەفاداری پێویستی بە تێگەیشـتنە لـەم مەسـەلەیە کـە جیـاوازیی بـیرورا بابـەتێکی ئاساییە.

کاتێك خەڵك و رێبەران لەسەر مەسەلەیەك جیاوازیی بیروڕایان هەیە، پێویستە ئەم جیاوازیی بیروڕایانە بەئاسانی لەنێوان یەکتردا بێننە گۆڕێ، بۆ بیروڕای خۆیان بەڵگە و رێگەچارە پێشنیار کەن و شێوازی چاکسازییان بخەنە روو. رێبەران لە بەرانبەر خەڵکدا خاوەن ئەرك و بەڵێنی دوولایەنەن و هەرئەم هەست بە بەرپرسیارەتییەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بڕیارەکان بە شێوەیەکی رەوا بدرێ و لە چوارچێوەی ئامـانجی خـەبات و بـە پشتیوانی خەڵکەوە بە ئاکام بگات. یەکێك لە هۆکارەکانی دژایەتیی تاکەکان لەگـەڵ بڕیارەکاندا ئەوەیە کە لە دارشتنیاندا بەشدار نەبوونە و لەکاتی دانـی ئـەم بڕیارانـەدا لەگەڵیاندا راوێژ نەکراوە. لە خەباتە جەماوەری و بەکۆمەڵەکاندا، بڕیاردانەکان تا ئەو جێگەی کە دەلوێ، دەبێ بەشێوەی گرووپی و بەکۆمەڵ بێت. جەماوەر ئەو بەرنامانەی کە بەکۆمەڵ بڕیاری لەسەر دراوە بەگیان و دڵ وەردەگرن.[2] وەفاداری رێبەران کاتێك دەردەکەوێ کە بیروڕای باشترین و لێهاتووترین تاکـەکان لـە پرۆسـەی بڕیاردانەکانـدا رەنگ بداتەوە.

## ناسینی دوژمنان:

بەو واتایەی کە بچووکترین زانیارییەك کە لە دوژمن لەبەردەستدایە کۆ بکرێتەوە و تاوتوێ بکرێ. هاوکات لەگەڵ کۆکردنەوەی ئەم زانیارییانە، وەڵامی ئەم پرسـیارانەش تاوتوێ بکرێ کە دوژمن چـۆن بـیر دەکاتـەوە؟ دژەکـردەوە ئاسـاییەکانی چـۆنە؟ لـە

(١) ئەم مەسەلە لەبارەی خـەڵکانێکی وەك ئێمـەوە کـە هـەموو شـتێك یـان سـپی یـان رەش دەبیـنین زۆر گرینگە.لەگۆشەنیگای ئێمە ئێرانییەکانەوە قارەمانەکانی ئێمە یان خاوەن هەموو تایبەتمەنـدیو خاسمانیگـەل پۆزەتیڤن یان سەرتاپایان پرە لەئیرادو هەڵە. بڕیارەکانی ئەوانیش یـان لەسەداسـەد شـیاوی بـەرێوەبردنن یـان لەبنەڕەتدا نادروستو دواکەوتوانەن_ و.

(٢) لەئەساسدا یەکێك لەهۆکارەکانی خواستراوی دیمۆکراسی ئەمەیە کە خەڵك بڕیارگەلێك بەئەنجام دەگەیەنن کە خۆیان داویانە_ و.

رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بارودۆخی قەیراناویدا چۆن کـردەوە لـە خـۆی نیشـان دەدات؟ بیروباوەڕەکانی چییە؟ بایەخ و دژەبایەخە هزرییەکانی ئەو چییە؟

گرینگتر لە هەموو ئەوەیە کە بۆ ئەم پرسیارانە، وەڵامدانەوەیەکی پسپۆڕانە و دوور لە هەست بدرێتەوە، دوژمنی راستەقینە کێیە؟

تایبەتمەنـدی و تواناییـەکانی رێبـەرانی سـەرەکی کـە بەرپرسـیاری سـەرکوت و شکستەکانی بزووتنەوە جەماوەرییە دیموکراسی خوازانەکانن، چییە؟

بەناسینی دوژمـن و شـرۆڤەکردنی تواناییـەکانی، دەتـوانین کـردەوە و بڕیارەکـانی پێشبینی بکەین.

## ئەزموون (تاقی کردنەوە)، رووناکی رێی داهاتوو:

ئەو شێوازی کردەوەیەی  کە پێی میتۆد و رێچکەی کارەکانمـان تـاقی بکەینـەوە، دژوارترین و پڕ تێچووترین میتۆدە. لە حاڵێکدا باشترین و کارامەترین میتۆد ئەوەیـە کە لەکردەوە و هەڵەکان وسەرکەوتنەکانی دیتران ئەزموون وەربگرین. بـۆ هێنـدێ لـە تاکەکان کە توانایی فێربوون و ئەزموون وەرگرتن لـە هەڵـەکانی خۆیـان نییـە، تـاقی کردنەوەی راستەوخۆ مامۆسـتایەکی بـاش نییـە. لـەم سـاڵانەی دواییـدا سەرچـاوە و کتێبگەلێکی باش لەسەر شێوازەکانی خەباتی ناتوندوتیژی و رێگەچـارەکانی خراوەتـە بەردەست. خەڵك و رێبەرانی خـەباتی جـەماوەری پێویسـتە بـە کـەڵك وەرگـرتن لـە ئەزموونەکانی دیتران گرینگی بدەن  و لـە ئـەزموون کردنـی هـەر میتۆدێـك لەلایـەن خۆیانەوە خۆببوێرن، تا تێچووەکانی خـەبات کـەم بێتـەوە . لـە وڵاتـە جیاجیاکانـدا، هێندێ رێکخراوی جەماوەری هەن کە زانیاری و ئەزموونەکانی وڵاتی خۆیان لە خزمەت نەتەوەکانی تردا دادەنێن.

لە قۆناغە جیاجیاکانی خەباتدا، پێویسـتە رێبـەران راپۆرتێـك بـەناو" ئەزموونـە فێربـووەکـان" ئامـادە بکـەن، تـا توانـایی و لاوازییـەکان تـاوتوێ بکـەن و لـە دووپاتکردنەوەی هەڵەکان لە داهاتوودا پێشگیری بکەن. بەهێندێ ئـەزموونی کـاتی و بیرکردنەوە لە خەباتی ستراتیژیك، رێبەران ناتوانن ببنە کەسـانێکی بەرنامەداڕێـژ بـە کردەوەی ستراتیژیکەوە، بەڵکو ئەم شـارەزاییە پێویسـتی بـە ئـەزموونی کەسـەکی و

جێگرتن لە شوێنگەکانی خەباتدا بە شێوەی ڕاستەوخۆ، یان سەردان و کەڵك وەرگـرتن لە ئەزموونی خەڵکی ترە.

### باشترین کەڵك وەرگرتن لە تواناکانی تاکەکان:

ڕێبەران پێویستییان بەوەیە کە باشترین و لێ وەشاوەترین تاکەکان بۆ بەرپرسایەتییە گرینگەکان هەڵبژێرن. بۆ ئەوانەی کە مێژووی شەڕی دووەمی جیهانییان خوێندۆتەوە، نـاوی ژنـراڵ پـاتۆن[1] و ئایزێنهـاور[2] ئاشـنایە. هـەرکام لـەوان بەرپرسـایەتی و توانایییـەکی تایبـەتییان لەبـەرەی هاوپەیمانەکانـدا لـەخۆیان پیشـان دا. پـاتۆن فەرماندەیەکی هەڵکەوتە و لێ وەشاوە بوو کە کاروانە سەربازییەکانی خـۆی بـۆ شـەڕ لەگەڵ دوژمن لەبەرەی شەڕدا بەشێوەیەك ڕێنمـایی دەکـرد کـە ئەگـەر لـەجێی ئـەو، فەرماندەگەلێکی دیکە دەبوون، چالاکییە نیزامییەکانیان بەهۆی سنووردارێتی شەڕەوە بە محاڵ دەزانرا. ئەو فەرماندەیەکی زیرەك و جێگای ڕێز بوو. ئەگەر بەهۆی لێهاتوویی و توانایییە نیزامییەکانی ئەوەوە نەبوایە، بەدڵنیایییـەوە دەبـوا بـەهۆی ئـەو کـردارە خۆبەزلزانانە و سووکایەتییە بـێ شـەرمانەیەوە کـە کردبوویـە هێنـدێ لـە فەرمانـدە نیزامییەکان، لە بەرەی شەڕ دەربکرایە. لە سۆنگەیەکی ترەوە ئایزێنهـاور لـە زەیـنی خەڵکدا، وێنەی ئەفسەرێکی ناوەندی بەتوانا و بەئـەزموون بـوو کـە ورەی هاوکـاری، هاوفکری و هەڵکردنی لەگەڵ خەڵکی تردا بوو. بەهۆی ئەم تایبەتمەندیگەلەوە، ئەو بوو بە فەرماندەی بەرەی شەڕ بۆ ڕزگارکردنی ئەورووپا. ئەو بەهۆی تایبەتمەندیگەلێکەوە کە هەیبوو، لێ هاتوویی ئەوەی بوو کە هاوکات هێـزە نیزامییـەکانی وڵاتـە جیاجیاکـان فەرماندەری بکا و بۆ شەڕ لەگەڵ ئاڵمانییەکاندا ڕێنماییيـان بکـات. ئـەم شـەڕە بـە دژوارترین شەڕی نیزامیی مێژوو ناوی دەرکردووە.

ئەم نموونە پیشان دەدات کە ڕێبەرانی هاوپەیمانـەکان ئەفسـەرێکی فەرمانـدەیییان بەهۆی لێ هاتووییە تاکە کەسییەکانییەوە لە هاوئاهەنگی و هاوکاری لەگەڵ کەسانی دیکەدا بەسەر فەرماندەیەکی زیرەکـی شـەڕکەردا لەسـەر تـر دادەنـێن و گـەورەترین چالاکیی مێژووی پێ دەسپێرن.

---

(1) Patton
(2) Eisenhower

لە خەباتە ناتوندوتیژییەکانیشدا هەربەم شێوازەیە. پێویستە ڕێبەرەکان توانـایی و لێ هاتووییەکانی تاکەکان بەباشی بناسن و بۆ بەدەستهێنانی باشترین ئاکام کەڵکیان لێ وەرگرن.

## ڕێبازی ڕێبەرەکان:

ڕێبازی ڕێبەران لە پانتایی توتالیتاریزم و دەسەلاتخوازیی پاوانکراوەوە تا ڕێبازی دیموکراسی _کە باوەڕی بە بڕیاردانی بەکۆمەڵ و تەگبیر هەیە بگۆڕە. ڕێبازی ڕەچاوکراوی ڕێبەرەکان بەستراوەتەوە بە بارودۆخەوە. هۆکارێکی دیکە کە لە ڕەچاوکردنی ڕێبازی ڕێبەراندا کاریگەری هەیە، وەك یەك بوونی ڕێبازە لەگەڵ پێکهاتەی کەسێتیی ڕێبەراندا.

بەشێوەی گشتی، لەسەرەوەتربوونی ڕێبەرانی دەسـەلاتخواز و کارامـەیی ئـەوان لـە بارودۆخی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

* لە بارودۆخی قەیراناویدا کە پێویستە بڕیارەکان زووتر ڕەچاو بکرێن.

* لەدۆخێکدا کە سیستەمی ڕێکخراوەییـەکی بـاش بـوونی نییـە و تاکـەکانیش ڕێبەرانی خۆیان بەباشی ناناسن.

* لە کاتێکدا کە خەبات شکستی هێناوە و تاکەکان نیازیان بەم باوەڕە هەیە کـە ڕێبەری ئەوان بەباشی دەزانێ کە چ پەرچەکردارێك دەبێ ئەنجام بدات.

* لە بارودۆخە قەیراناوییەکان کە دەرفەتی پێویست بۆ ڕاوێژکردن لەگەڵ دیتران و هاوفکری بوونی نییە، ئەگەرچی بۆ ئەم بارودۆخگەلـە دەبـێ بەرنامـەی شـیمانەیی و قەرەبووکردنەوە لە پێشدا ئامادە بکرێ، بـەلاّم بڕیـار بـۆ جـێ بـەجێ کردنیـان دەبـێ بـەخێرایی ڕەچـاو بکـرێ و بڕیـارە تاکتیکییـەکان بـە خـوارترین ڕیزەکـانی گـرووپ بگەیەندرێت.

* لە بەرانبەر ئەم بەسەرەوەبوونەدا، کەم و کورتیگەلێکیش لە مودێلی بڕیـاردانی ناوەندگەرادا هەیە. بەپێچەوانەی بارودۆخی نیزامـی و جـەنگی کـە تاکـەکان لەسـەر بنەمای یاسای نیزامی ناچـارن فەرمانـەکان بـەڕێوە بـەرن، لـە خـەباتی جـەماوەریی ناتوندوتیژیدا، خەڵك ناچار بە بەرفەرمانی نین و کەسیش ناتوانێت ئەوان ناچـار بـەوە

بکات کارێك بەزۆر بەڕێوە ببەن. ئەوان تەنیا بەم هۆیەوە کارێك بەڕێوە دەبەن کە بەئەنجامدانی باوەڕیان هەیە ( ئەگەرچی لەهێندێ لە کولتوورەکاندا، خەڵك تەنیا بەم هۆیە کە شوێنکەوتەی ڕێبەرەکانن و دەبێ دەستوورەکانی ئەوان بەڕێوە ببەن، بۆ بەئەنجام گەیاندنی فەرمانەکانی ئەوان تێدەکۆشن). ئەگەر خەڵك لە بڕیاردانەکاندا بەشدار بکرێن و بەم باوەڕە بگەن کە لە پرۆسەی بڕیارداندا ڕۆڵیان هەیە، زۆر چالاك تر و کاریگەرتر لە خەباتەکاندا بەشداری دەکەن، چونکوو دەزانن لە ئەگەری سەرکەوتندا، بڕیارەکانی ئەوان بە ئاکام گەیشتووە.

لەسەرەوەتربوونی ڕێبەرانی دیموکرات و کۆخواز لە مەدایە کە ورەی بەشداری لە شوێنکەوتوانی خەباتدا دەبەنە سەرەوە، بەم هۆیە کە لە بڕیاردانەکاندا بەشدار بوونە. توانایی تاکەکان لە نوێ گەریدا بەهێز دەبێت، لە بابەتگەلێکدا کە کاتی پێویست لە بەردەستدا بێت ڕێبەر دەتوانێ بە ڕاپرسی لەتاکەکان (بۆنموونە بەشێوەی تۆفانی زەینی) بەکەڵك وەرگرتن لەتوانایی ئەوان گرفتەکە چارەسەر بکات.(۱)

یەکێك لە ئاکامەکانی ئەم بەڕێوەبەرییە ئەمەیە کە تاکەکان دەزانن بڕیارەکان بۆچی و چۆن ڕەچاو کراون و ئەم میتۆدە دەبێتە هۆی بەرز بوونەوەی هەستی باوەڕپێکردنی دوولایەنە و ڕاستبێژیی گرووپ.

ئەم شێوازی ڕێبەرییە، کەم کەم هەستی باوەڕپێکردن و قبووڵکردنی ڕێبەر لەناو تاکەکانی گرووپدا پێك دێنێت و بۆ پەروەردەکردنی تواناییەکانیان بۆ ڕێنمایی و ڕێبەریی کۆمەڵگای دیموکراتیکی داهاتوو یارمەتییان دەدات .

لە مودێلی ڕێبەریی دیموکراتیکدا هێندێ لاوازیش هەیە. یەکەم ئەوەیە کە، ئەگەر ڕێبەر هێندێ لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ڕێبەری نەبێت، لاوازییەکان خۆدەردەخەن(۲) و دووەم ئەوەی کە پرۆسەی بڕیاردان کاتێك کە بیروڕا و ڕوانگەی

---

(۱) شێوەی تۆفان(زریان)ی زەینی لەسەر ئەم بنەمایە داڕێژراوە کە تاکەکان بێ ئەوەیکە لەپێشدا لەبابەتی کۆبوونەوەکە ئاگادار بن لەو کۆبوونەوەدا حازر دەبن‌و بێ بیرکردنەوەو بێ ئەوەیکە بکەونە ژێر کارتێکەری بیروباوەڕی کەسانی دیکەوە، ئەوەڵین چەخماخە(پزیسك)ی فکرییەك کە لەزەینیاندایە دەیخەنە روو ـــ و.

(۲) هەڵبەت ئەم بابەتە پێش لەوەی کە لایەنێکی نگەتیڤی دێموکراتیك بێت، هێزێکە چونکوو لاوازییەکانی ڕێبەر پێش لەبەڕێوەبردنی کارەکان ئاشکرا دەبێت کە ئەمە خۆی لە خەرج‌و خەسارەتە شێمانەییەکان کەم دەکاتەوە - و

جیاجیا لە نێوان ئەندامانی گرووپدا هەبێت، زۆر درێژە دەکێشێت.

جیا لەوشێوە بەڕێوەبەرییە کە ڕێبەران بۆ خۆیان ڕەچاوی دەکەن، یەکێك لە ئەرکەکانی ئەوان ڕاهێنانی ئەندامانی گرووپەکەیە. بەو واتایەی کە دەوروبەرەکانیان لە ڕەوتی بڕیاردانەکاندا ئاگادار بکرێنەوە و بزانن کە بۆچی هێندێ لە زانیارییەکان لە هێندێکی دیکە گرینگترن و هەروەها توانای بڕیاردانی تاکەکان بە ڕادەربڕین زیاد دەبێت. هەڵبەت پێویستە ڕادەربڕینەکان هەڵسەنگێندرێن و هەلاجی بکرێن تا تاکەکان لە لاوازییەکانیان تێ بگەن.

بەواتایەکی دیکە پێویستە ڕێبەر، مامۆستا و ڕاهێنەری ئەندامانی گرووپ بێت. ڕاهێنانی تاکەکان لە هەموو ئاستەکان لە ڕەوتی خەباتی ناتوندوتیژیدا، دەبێتە هۆی زیاتربوونی متمانە، ڕاستبێژی و هەستی دەروەستی. ڕێبەرێك کە بە پەروەردەکردن و بردنەسەرەوەی لێهاتووییەکانی تاکەکانی گرووپ و دیاریکردنی جێگر _ بۆ ئەو کاتەی کە بەهەر هۆیەکەوە خۆی لە خەباتدا بەشدار نییە _ هەنگاو هەڵ نەهێنێتەوە، ڕێبەرێکی شیاو نییە.

## دۆزینەوەی سەرچاوە و هۆکارە بنەڕەتییەکانی ترس:

ترس لە پێکدادانی فیزیکی، هەستێکە کە هەموو مرۆڤەکان لە درێژەی ژیانی خۆیاندا ئەزموونیان کردووە. تا کاتێك کە دەرەنجام و سەختیی پێکدادانە فیزیکییەکان لە زەینی تاکەکاندا بمێنێتەوە، کاریگەریی نگەتیڤ لەسەر کردەوە و دەروونی ئەوان دادەنێ.

یەکەم هۆکارێك کە خەڵك بە گوێرایەڵیی دەسەڵاتدارانی سەرەڕۆ ناچار دەکات، ترس لە ئازاردان و تەمێ کردنە. ترس لە لێدان وکوتان و کەم ئەندام بوون زۆر سامناکترە لە ترسی لە دەستدانی پیشە یان بڕینی مووچە و پاداش.

ترسی لە دەستدانی گیان، ترسێکی دەروونییە و تەنیا ئەو کەسانە هەست بەم ترسە ناکەن کە بە پیرەوەچوونی مەترسی بەشێوەی سروشتی و زگماکی وەکو لە باوەش گرتنی منداڵێك هەست پێ دەکەن. زۆربەی خەڵك لەم نوکتە خافڵن کە ترس، وەڵام و دژکردەوەیەکی سروشتییە بە هەڕەشەی هەست پێکراو. ترس دژکردەوەیەکە کە بەشێوەی

ژێنێتیکی لە مێشکی ئێمەدا بوونی هەیە، تا لە بەرانبەر هەڕەشە مەترسیدارەکاندا بەرگری لە خۆمان بکەین و ژیانی خۆمان رزگار بکەین.

ترس وەلاّمێکی سروشتییە بۆ هەرەشەکان و هەموو گیانلەبەرەکان لێی بەهرەمەندن. بەهۆی ئەم زکماکی و سروشتی بوونەیە کە نەترسین نیشانەی بایەخی ئاکاری و لەسەرتربوونی تاکەکەسی نییە و شەرم نییە بۆ ئەو کەسەی کە ترساوە سەرکۆنەکردنیشی پێویست نییە.

ناسینی ترس لە گرەوی ناسینی هاندەرە پێکهێنەرەکانیدایە. کاتێك ئێمە لە بوونی شیمانەیی مەترسیی فیزیکی ئاگادار دەبینەوە، جەستەی ئێمە بەشێوەی سرشتی بۆ بەرگری لە خۆی ئامادە دەبێت. سرشتی ئێمە دوو رێگەچارە لەبەردەمماندا دادەنێت_ هەلّهاتن یان شەڕکردن کە زۆرجار هەلّهاتن باشترە. ئەم وەلاّمە سروشتییە لەناو زیندەوەرەکانیشدا هەیە کە بەهەست کردن بە مەترسیی مردن هەلّدێن.

لەهێندێ بابەتدا هاندەرەکانی ترس ئەوەندە توندن کە دەبنە هۆی لەکار کەوتنی سیستەمی بەرگریی جەستە و بوونەوەری ترساو، بەچەشنێك وێستاو و نەبزوو(مێخ رێژکراو) دەبێ کە تەنیا چەك بۆ بەرگریی لە خۆی لە هێرش نەکردن یان چاوپۆشی لایەنی بەرانبەریدا دەبینێ.

مرۆڤ بەشێوەی سرشتی بە توانای ناسینی دەرەنجامەکانی مەترسی تەیارە و دەتوانێ بە کەلّك وەرگرتنی هەرچی زیاتر لە عەقلّ بەبەراورد لەگەلّ سرشتدا، دەستی بە رێگەچارەگەلێك بگات بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەلّی دا.

بەناسینی دەرەنجامەکان و هۆکارەکانی ترس، دەتوانین لەکاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەلّ دۆخی مەترسیداردا، ئەو کاریگەرییانەی کە ترس لە دەروونی ئێمەدا پێکی دێنێ، لەناو ببەین.

### دەروونناسی ترس:

هێما و نیشانە "فیزیکی"یەکانی ترس ئاکامی زێدە بوونی دەردراوەکان لە بەشی هاودلّ(سەمپاتیك)ی سیستەمی دەمارییەوەیە. ئەم دەردراوگەلە دەبێتە هۆی چوونەوەیەکی دەمارەکانی پێست و دەمارەکانی دەروون، کە ئەمە خۆی دەبێتە هۆی زیادبوونی هەناردنی خوێن بۆ ناو دلّ و ماسوولکەکان ( زیادبوونی فشاری خوێن).

ترس هەروەها دەبێتە هۆی زیاتر لێدانی دڵ و توندتر بوونی و هەروەها زێدە بوونی رادەی هەناسەدان( بۆ ناردنی ئۆکسیژنی زیاتر بۆ ماسوولکەکان). دنەدانی سەمپاتیك دەبێتە هۆی رژاندنی(تەرەشوح) ئادرنالین لە تۆمۆری سەرگورچیلەوە کە ئەم دەردراوانە لەپاڵ هۆرموونەکانی دیکەدا دەبێتە هۆی ئازادبوونی تا رادەیەکی زۆر و زەوەند گلۆکۆز لە جەرگەوە بۆ ناو سوڕی خوێن. ئەم رەوتە دەبێتە هۆی دروست بوونی وزە بۆ ماسوولکەکان.

کاتێك ئەم قۆناغە لە حاڵی تێپەڕین دایە، مرۆڤ هەوڵ دەدات خۆی بۆ بەرنگاریی ئامادە بکات و جەستەش لە هەوڵدایە بۆ رزگارکردنی خۆی لە برینە جەرگبڕە شیمانەییەکان. شانە(خانە) ماسوولکەییەکانی کۆتایی ریخۆڵە و میزڵدان لە حاڵەتی هەڵپەسێراودا دەمێننەوە کە لەهێندێ بابەتدا دەبنە هۆی هاتنەدەرەوەی خۆنەویستانەی(نائیرادی) پیسی و میز.

مرۆڤ ئەم ئەزموونانەی تێپەڕاندووە و تەنانەت بۆ ئەوانەش دەستەواژە و چەمکگەلێکیشی دروست کردووە، وەکو"لە ترسا زاوەرم تۆقی"، "لە ترسا توکی جەستەم رەق بووە یان راسبووەتەوە"، یان "لە ترساخۆمم ...".

راستییەکەی ئەمەیە کە مرۆڤ لە کاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بارودۆخی مەترسیداردا دەترسێ و خۆی دەدۆڕێنێ، بەڵام دەرکەوتنی هێماکان و نیشانەکانی ترس لە روومەتدا، نابێ ببێتە هۆی شەرمەزاری، چونکوو ئەمانە نیشانەی کاردانەوەی دروستی ئەو غەریزە سرشتییانەیە کە بۆ بەرگری لە مرۆڤ کار دەکەن.

## زاڵبوون بەسەر ترسدا:

ستراتیژی خەباتی ناتوندوتیژی پێویستی بە خواست و ویستی گشتییە و بۆ بەدەستهێنانی ئەم بابەتە هەموو خەڵك دەبێ بەسەر ترس و دەرەنجامەکانیدا زاڵ بن کە ئاکامی ئازاردانە توندوتیژانە و فیزیکییەکانە بۆ سەرکوتکردنی خەبات. بەدڵنیاییەوە ئەگەر مرۆڤ بەسەر پاڵنەرەکانی ترسدا زاڵ بێت، زنجیرەی ئەو رووداوانە کە دەبنە هۆی پێکهاتنی ترس لە دەروونی مرۆڤدا لەناو دەچن. رەنگە ساکارترین و پاشکەوتووترین

شێوازی بەرەنگاری لەگەڵ ترسدا، چاو نووقاندن لەسەر راستییەکانی ناو کۆمەڵگا و هەڵهاتن لە بارودۆخی هەنووکە بێت.

بە بەکارهێنانی ئەم شێوازە، یەك بەیەکی تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایە وەکو ئەندامی تەنیا و پەرتەوازە، بەدوور لە هیچ یەککگرتنێك تەنیا شایەتحاڵی درێژەی دۆخی هەنووکە دەبن و بەخۆ دوورگرتن لە باسکردنی داخوازییەکان، لە هەرمەترسی و دۆخێکی مەترسیدار خۆیان دوور دەگرن. بەڵام لە درێژەی ئەم بەشەدا هەوڵ دەدەین تا بە خستنەبەردەستی شێوازەکانی زاڵبوون بەسەر ترسدا، دەرەتانی کەرەستەی بەرهەڵستکارییەکان پێك بێنین. هەڵبەت شیکردنەوەی ئەم خالە گرینگە کە مەبەست لە کەرەستەی دژایەتییەکان، ئامێر بەشێوەی مەدەنی و ناتوندوتیژانەیە.

رێگەچارەیەك کە هەوڵ دەدەین بیخەینە روو، رێگە چارەیەك لەسەر بنەمای بەرنامەڕێژی رێکوپێك بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ترس و لەناوبردنی دنەدەرەکانییەتی تا بە پشت بەستن بە بەرنامەڕێژی، دوژمن لە پێکهێنانی هاندەرەکانی ترس رابگرین.

ئەم رێگەچارانە بە چڕبوونەوە لەسەر شێوازگەلێك گەڵاڵەکراون کە دەبنە هۆی کەم بوونەوەی پێشهات و رووداوگەلێك کە دەبنە هۆی هاتنەکایەی بارودۆخی تۆقێنەر و دڵەڕاوکێ هێنەر.

یەکێك لەو رێگەچارانەی کە دەبنە هۆی کەم بوونەوەی ترسی خەڵك لە کاتی خەباتی جەماوەریدا، وردبوونەوە لە هەڵبژاردنی شوێن وکاتی کۆبوونەوەکاندایە. خاڵێکی دیکە ئەمەیە کە رێبەران و چالاکان، دەبێ لە ماوەی کۆبوونەوەکاندا بە بەهێزکردنی ورە و بردنەسەرەوەی هیوای سەرکەوتن و سەربڵندیی خەڵکەوە خەریك بن و پێش لەوەی کە هێزە دژە شۆڕشەکان هێرش بکەنە سەر کۆبوونەوەکان، بڵاوە بە خەڵکەکە بکەن.

یەکێکی دیکە لەو شێوازانەی بۆ خەباتی جەماوەری بەسوودە و بە کەمبوونەوەی ترسی جەماوەر یارمەتی دەدا، ئەمەیە کە هاوکات لە شوێنە جیاجیاکانی شاردا کۆبوونە بکرێ، تا لەم رێگاوە توانایی هێزە ئەمنییەکانی رژێم دابەش بێت و لە ئاکامدا هێزی سەرکوتگەری ئەوان کەم بێتەوە.

خافڵگیربوون زۆرجار دەبێتە هۆی ترسانن. ئامادە کردنی هێزەجەماوەرییەکان و بەهێزکردنی ورەی ئەوان بۆ خەبات لە خافڵگیربوون پێشگیری دەکات. ئەم ئامادەسازییە بریتییە لە وەبیرهێنانەوەی ئامانجەکانی خەبات بە خەڵك، دانی زانیاریی رێکوپێك لە

ڕێژەی هێزەکانی پۆلیس بەوان، بەرنامەڕێژی ڕێکوپێك بۆ دژکردەوە و دیاریکردنی کاتی پێویست بۆی و هەروەها بەڕێوەبردنی هێندێ پڕۆڤە پێش لە کۆبوونەوە. هەنگاوی لەباری دی ئەمەیە کە بۆ خەڵك روون بکرێتەوە کە لە ماوەی کۆبوونەوەکەدا، لەوانەیە ئەوان لەگەڵ هێزەکانی پۆلیسی دژە شۆڕشدا ڕووبەڕوو ببنەوە. تەنانەت لەم بارودۆخەدا باشتروایە کە دۆخی فیزیکیش بۆ ئەوان ڕوون بکرێتەوە“ وەکو ئەوەی کە لەوانەیە دەنگی وێکەوتنی تێلا (شوشکە) لە کالان خراوەکان ببیسن و بریقەی سەرەنێزەی سەر چەکەکان ببینن. ئەم ڕیگاخۆشکردنە بە ئامادەبوونی زیاتری خەڵك یارمەتی دەدات. لە ماوەی کۆبوونەوە تێکەڵ بەرێپێوانەکاندا خەڵك دەبێ بە دەستە و گرووپی جیاجیا دابەش و ڕێك بخرێن و چالاکیگەلێکی روونیان پێ بسپێردرێ.

پێکهێنانی ڕێباز و ڕیٚنیشاندەرێك بۆ یەك بەیەکی تاکەکان تا بزانن کە لە بارودۆخی قەیراناویدا چۆن دەبێ کار بکەن، یەکێك لە هەنگاوە بنەڕەتییەکانی خەباتی جەماوەری بۆ زیاترکردنی تەکووزییە. چالاکییە گرووپی و هاوئاهەنگ کراوەکان بەتایبەت لە دۆخێکدا کە گرووپ لەژێر فشاردایە، بەبێ بوونی سیستەم و ڕێسا، کاریگەر نابن.

خەڵك دەبێ جیاوازیی نێوان کۆبوونەوەی کەسانی نادەرەوەست و کۆبوونەوەی ئەو خەڵکە بزانن کە هەوڵیان گەیشتنە بە ئامانجێکی دیاریکراو.

زەقترین نموونە لەم بوارەدا پڕۆڤەیەکە کە لەقوتابخانەدا بەناوی "مانۆڕی ئاگرکەوتنەوە" بەڕێوە دەچێ. لەم پڕۆڤەیەدا قوتابییان لە دەستەگەل دیاریکراودا ڕیز دەبن و بەرەولای دەرگاکانی ڕۆیشتنەدەرەوە و شوێنە بەر بەتاکەکان ڕێنوێنی دەکرێن. لە یەك یان دوو خولەکدا نزیکەی سەد قوتابی لە ئاگر ڕزگاریان دەبێ. لەم بارودۆخەدا مامۆستایان دەزانن کە بە چ شێوەیەك و لە چ کاتێکدا، چ کردەوەیەك دەبێ ئەنجام بدەن و قوتابییەکانیش لە ڕێنوێنییەکانی ئەوان پێڕەوی دەکەن. ئەم بارودۆخە لەگەڵ ئەو کاتانەدا کە ئاگرکەوتنەوە لە سینەماکان وگازینۆ(کلووپ)کاندا ڕوو دەدات، هەڵسەنگێنن“ جەماوەر هاوکات لەگەڵ یەکتردا بەرەولای دەرگاکانی ڕۆیشتنەدەرەوە هێرش دەبەن، لە ئاکامدا ڕێژەیەکی زۆرکەم سەرکەوتوو دەبن خۆیان ڕزگار بکەن و لە زۆر کاتدا کەس ڕزگار نابێت و هەموو تاکەکان لەناو دەچن. ئاکام لیٚوەرگرتن ساکارە“

پێویستە ڕێبەران بەرنامەیەکی باش ئامادە بکەن و هەموو جەماوەری بەروونی لێ ئاگادار کەنەوە و لەکاتی خەباتدا لە بەرەوپێشچوونی بەرنامەکەیان دڵنیا بن.

باوەڕبەخۆبوونی ڕێبەران دەبێتە هۆی زیادبوونی باوەڕبەخۆبوونی خەڵك و کاتێك کە خەڵك باوەڕبەخۆبوونیان بەدەست هێنا، کەمتر هەست بە ترس و دڵەڕاوکێ دەکەن. تازەهاتووەکان دەبێ بەراهێنانی باش بگەنە باوەڕبەخۆبوونی پێویست و بەگواستنەوەی ئایدیال و ئامانجەکانی خەبات بۆیان و تێگەیاندنی ئەم بابەتە کە ڕێبەران بەدوای بە ئاکام گەیشتنی داخوازییەکانی خەڵکەوەن بۆئەوەی پاڵنەری تاکەکان بەرنە سەرەوە.

لێك تێگەیشتن، بیروڕاگۆڕینەوە و ڕاگەیاندن پێویستە بە باشی بەڕێوە بچێ. بۆنموونە ئەگەر بێت و یەکێك لە ڕێبەرانی خەبات بڕیار بدات تا لەریزی یەکەمی خۆپیشاندانەکاندا بوونی نەبێت، پێویستە بەئاگاداری دیتران بگەیەنێ و هۆکارەکەیشی شی بکاتەوە تا پێش لە خراپ تێگەیشتن بگیردرێت (ئەو دەتوانێ بە روونی بڵێ، ئەگەر بێت و لە ریزی یەکەمدا بم لە ڕەوتی گشتی خەبات دوور دەکەومەوە و ناتوانم بە باشی لەگەڵ ڕێبەرانی دیکەدا پێوەندی دروست بکەم و هاوئاهەنگی و هەنگاوی پێویست بۆ پێشگرتن لە زەرەر و زیانەکان هەڵێنمەوە. ئێمە ئامانجی خەبات دەزانین و بە یارمەتی یەکتر بە ئاکامی دەگەیێنین).

ڕێبەران سەرەڕای ئەوەی کە شێوازی کردەوە و مەترسییەکانی خەبات بۆ خەڵك شرۆڤە دەکەن، پێویستە هۆی سەرەکیی کۆبوونەوەی سیاسی و ئامانج لە ئالوگۆڕ و چاکسازیی سیاسیی پێویستیش بۆ ئەوان شی بکەنەوە" وەکو ئەوەی کە ئەم کردەوە تایبەت و کاتییە چۆن لەگەڵ ستراتیژیی گشتی و ئامانجی سەرەکیی خەباتدا پێوەندی هەیە و هەروەها خەڵك ئاگادار بکەنەوە کە هەڵوێستە بچکۆلە و کاتییەکان بۆ هاندانی تاکەکانی دیکە بۆ پەیوەستبوون بە خەباتە و بەم هەنگاوە دیتران تێ دەگەن کە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سەرەڕۆییدا مەحاڵ نییە.

لە ڕەوتی بەرنامەڕێژی خەباتی ناتوندوتیژیدا، ڕێبەران دەبێ هۆکارگەلێك بناسن کە دەبنە هۆی پێکهاتنی هەستی تەنیایی و نائومێدی لە خەڵکدا" بۆنموونە لە بەرپاکردنی کۆبوونەوەکاندا، خەڵك دەبێ شانبەشانی یەکتری و لە نزیك یەکترییەوە بن ورەیان بەرز بێتەوە. خەڵك دەتوانن بەگرتنی دەستی یەکتری بەشێوەی زنجیرەیی(یەك لە دوای یەك)و وتنی گۆرانی و سروود ئەم هەستە بەهێز بکەن کە بەتەنیا نین.

لەبەرکردنی جلوبەرگی یەکڕەنگ یان کەڵك وەرگرتن لە هێندێ لە هێماکان، لە باری دەروونییەوە ورەی ئەو خەڵکەی کە بە ئایدیال و بیروڕا و بڕیاری هاوبەشەوە پەیوەست بوونەتە خەباتی ناتوندوتیژییەوە، دەباتە سەرەوە.

یەکێکی دیکە لە بابەتە جێی سەرنجەکان، هەڵسەنگاندن و بەرنامەڕێژی هۆکارگەلێکە کە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ترس و دەرەنجامە خراپەکانی لەناو ئەو هێزانەی لە دەرەوەی خەباتدان. پۆلیس و هێزە ئەمنییەکان پێویستە ئاگادار ببنەوە کە ئەم ڕێپێوان یان کۆبوونەوەگەلە، ناتوندوتیژانەیە و هیچ مەترسییەك بەرۆکی ئەوان ناگرێت.

بۆنموونە هەڵسوکەوتی دۆستانە، رووگەشەکان و وتووێژە خۆمانییەکان لەگەڵ هێزە ئەمنییەکاندا زۆر کاریگەرە و بەم شێوە وشەکان و دروشمەکان لە کردەوەدا دێنە دی. ئەو تاکانەی کە لە ڕێگای خزمایەتیی، هاوڕێتی یان پێگەی کۆمەڵایەتی لەگەڵ هێزەکانی پۆلیسدا ئاشناترن، دەتوانن لە سەفی یەکەمدا دابنرێن تا بە هێزە ئەمنییەکان بسەلمێنن کە هیچ هەڕەشەیەکی فیزیکی و توندوتیژانە لەئارادا نییە. دەبێ زۆر ئاگادار بن کە هیچ کەسێکی چەکدار(تەنانەت ئەگەر مەبەست و نییەتێکی تایبەتیشی نەبێت) لەناو ئەو کەسانەدا کە کۆبوونەتەوە نەبێت، چونکوو بوونی ئەم کەسانە و هێندێ لە چالاکییە شیمانەییەکانی ئەوان لەوانەیە ببێتە هۆی مەترسیداربوونی بارودۆخەکە و سەرهەڵدانی پێکدادانی توندوتیژانە. جابۆیە هەموو تاکەکان پێویستە لەگەڵ ئامانجی سەرەکیی خەباتی ناتوندوتیژیدا _ بەدەستهێنانی سەرکەوتن دوور لە توندوتیژی_ ئاشنا بن.

لە زۆربەی کاتەکاندا، دەست پێکردنی پێکدادانی فیزیکی _ هەر چەند بەرتەسکیش، لەلایەن خۆپیشاندەرانەوە_ بەهانەیەکە بۆ هێزە ئەمنییەکان کە دەست بدەنە کوتەك کاری و جوێن پێدان بەخەڵك. لەهێندێ بابەتیشدا، هێزە ئەمنییەکان بە هەناردنی هێندێ لە هێزەکانی خۆیان بەشێوەی نەناسراو بۆناو ریزی خۆپیشاندەران، دژ بە هێزە ئەمنییەکان توندوتیژی دەنوێنن تا لەم ڕێگەیەوە بۆ سەرکوتی خوێناوی بەهانە دروست بکەن.[١]

(١) ئەم شێوازە بۆ سەرکوتکردنی دژبەران زۆر باوەو لەوڵاتی ئێمەشدا لەو نموونانە هەیە. بۆنموونە تیرۆری دەستکردی شا بەهانەیەك بوو بۆ سەرکوتو ئێعدامکردنی ئەندامانی حیزبی تودە _ و.

له هەرحاڵدا لەهێندێ بابەتدا کە هێزە ئەمنییەکان دەستەوداوێنی شێوازی توندوتیژی دەبن و پێکدادانی فیزیکی دێتە ئاراوە، پێویستە بەرنامەیەکی تۆکمە و رێکوپێك بۆ پشتیوانی لە بریندارەکان و ئازارپێگەیشتووان هەبێ. هەروەها پێویستە لە پێشتر، دەستە و گرووپگەلی پزیشکی و دەرمانیش بۆ بەئەنجامگەیاندنی یارمەتییە سەرەتاییەکان لەبەرچاو گیرابێت.

وەبیرهێنانەوەی ئەم راستییە کە هەنگاوی پێویست بۆ پشتیوانی کردن لە خۆپیشاندەران لەبەرچاو گیراوە، دەبێتە هۆی بەهێزبوونی ورەی ئەوان، بەڵام نابێ تا ئەم رادە بەم بابەتە گرینگی بدرێ کە لەناو خەڵکدا هەستۆکی(حەساسییەت) و ترس بنێتەوە و ئاکامی پێچەوانەی لێ بکەوێتەوە.

باشتر وایە هەرتاکێك جلێکی سپی خاوێنی هەبێ بۆئەوەی وەك باند لە کاتی پێویستدا بەکاری بێنی و هێندێ دەرمانی سەرەتاییشی پێ بێ. بۆچی جلی سپی؟ چونکوو بە خوێناوی بوون لەوێنەدا باشتر دەردەکەوی و بۆسوود وەرگرتنە دەروونی _ پرۆپاگەندەییەکان کارامەیی باشتری هەیە.

هەواڵنێرانێك کە وێنەی زیان پێگەیشتوان دەگرن لە راستیدا پردی پێوەندی نێوان خەباتگێران و راگەیاندنەگشتییەکانن. وێنەیەك لە بریندارەکان دەتوانێ خەبات بە سەدان ملیۆن کەس لە هەموو جیهاندا بگەیەنێت و ئەوان بۆ پشتیوانیی جیهانی لە خەبات بانگهێشت بکات. خەڵك دەبێ لەم دەرفەتانە، بۆ ئاشناکردنی خەڵکانی دیکە لەگەڵ ئامانج و ئایدیالەکانی خەباتی ناتوندوتیژانەی خۆیان کەڵك وەرگرن.

هەرکەس دەبێ ئەرکێکی دیاریکراوی لە بەرانبەر رووداوە شیمانەییەکاندا هەبێ و فکری خۆی بۆ ئەنجامدانی گرێ بدات.

پێویستە رێبەران جەخت لەسەر جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی تاکەکان بکەنەوە، چونکوو وردبوونەوە لەسەر ئەرکەکان و وردبینی لە بەئەنجام گەیاندنیاندا، شیمانەی ترسانی تاکەکان لە رووبەڕووبوونەوە، بیستن یان دیتنی نیشانە نەناسراوەکان کەم دەکاتەوە. لەبەرچاوگرتنی بچووکترین خاڵەکانیش یارمەتیی کەمبوونەوەی ترس و کۆنترۆڵکردنیان دەدات. (نموونەی قوتابخانەکە وەبیر بێننەوە)، پێویستە هێندێ لە تاکەکان ئەرکی هاوئاهەنگی و پێکهێنانی پێوەندی لەنێوان ریزە جیاجیاکاندا بەرێوە ببەن، پێویستە هێندێکیش هێماکان و نیشانە رەمزییەکان پێشان بدەن. هەروەها

گرتنی لافیته و دروشم له بەرانبەر روخساردا دەبێته هۆی کەمبوونەوەی ترس، چونکوو دەبێته هۆی ئەوە کە لەبەرچاودا نەبێت، پێویسته هێندێ له تاکەکانیش بە کۆکردنەوەی هەواڵ و نووسینی ڕاپۆرتەوە خەریك بن. هێندێکیش خەریکی دابەشکردنی ئاو لە نێوان خۆپیشاندەراندا _ بۆ پێشگرتن لە لاوازی و کەمبوونەوەی تاقەت و وزەی خەڵك_ بن. پێویسته کەسانێکیش ئەرکی ئامادە کردنی دروشمەکان، سروودەکان و دەسپێکردنی ئەوانەیان لە ئەستۆ بێ.

لە روانگەی تاکەکەسیشەوە هۆکارگەلێکی سۆزداریش هەن کە یارمەتیی کەمبوونەوەی ترس دەدەن_ وەکو قبووڵکردنی ئەوەی کە ترس دیاردەیەکی سروشتییە و تاقیکردنەوەی نیشانەی لاوازی و داماوی نییە، بەڵکو کارێکی ئاساییە" یان باوەڕ بەوەی کە ئامانجەکانی خەبات نرخی بە گیان کڕینی مەترسی هەیە و ئەم مەترسییانە دەبێتە هۆی پتەوتربوونی بەڵێنەکان. خاڵێکی دیکە_ دەروەستیی ئاکاری لە بەرانبەر بەڕێوەبردنی ئەرکێکدایە کە بە تاك سپێردراوە، ئەم دەروەستییە دەبێتە هۆی ورەپێدان بەو.

هەرواکە هەستی نەتەوایەتی لە پێکدادانە نیزامییەکاندا دەبێتە هۆی گیانبازی، بێ باکی و نەترسی، لە خەبات بۆ دیموکراسی و حکومەتی یاساشدا _ وەفاداری بە ئامانجە گشتییەکان، خۆشەویستی بۆ ئازادی، یەکسانی و داهاتوویەکی باش بۆ هەموان _ دەبێتە هۆی کردەوەگەلی دلێرانە، بێ باکی و گیان فیدایی.